# هەورە بروسکە

**زەکەریا تامر**

**وەرگێڕانی**

**جیهان عومەر**

هەولێر - 2013

- **هەورە بروسکە**
- نووسینی: زەکەریا تامر
- نەخشەسازی ناوەوە: سەنگەر دلاوەر
- بەرگ: ڕێمان
- ژمارەی سپاردن: () لەساڵی 2011
- نرخ: (1500) دینار
- چاپی یەکەم : 2013
- تیراژ: 1000دانە
- چاپخانە: چاپخانەی موکریانی (هەولێر)

**زنجیرەی کتێب** (708)




**ماڵپەڕ**: www.mukiryani.com

**ئیمەیل**: info@mukiryani.com

# ناوەرۆك

# دەستپێك

بەقەڵەمی عەبدوڵڵا تاهیر بەرزنجی

(زەکەریا تامر) یەکێکە لەچیرۆکنووسە ناودارەکانی عەرەب و ڕۆڵێکی دیاری لە نوێکردنەوەی چیرۆکی عەرەبیدا هەیە، دەنگێکی جیاوازو جیای ئەم بوارەیە، شێوازی نووسینی بەئاسانی دەدۆزرێتەوە و چیرۆکی لەناو هەزارەها چیرۆکدا دەدۆزرێتەوە.

(زەکەریا تامر) لەساڵی (1931 ز) لە (دیمەشق) لەگەڕەکێکی کۆن و پەراوێزخراودا لەدایك دەبێت، بۆیە بوێرانە لە نێوەندە ئەدەبییەکەدا هاواردەکات و دەڵێت: من کوڕی گەڕەکە میللییەکانم.. یەك بۆ ئەوەی شەرم بشکێنێت و دوو بۆ ئەوەی بەرەنگاری بۆرجواکان بێتەوە و لە نووسین و شێوازی ژیاندا دژیان بوەستێتەوە.

(تامر) هەرزوو لە قوتابخانە دوورکەوتەوە، لەتەمەنی سیازدە ساڵیدا قوتابخانەی جێهێڵا و کەوتە گەڕان بەدوای ئیشکردندا، دەیەها ئیشی لەبازاڕدا تاقیکردەوە، بەڵام خۆشترینیان بەلایەوە (ئاسنگەری) بوو، بەڕادەیەك ئێستاش لە تاراوگەوە لەچاوپێکەوتنەکانیدا سۆزی خۆی دەرئەبڕێت و یادی ئەو ڕۆژانەی ژیان و بازاڕی ئاسنگەرانی دەکاتەوە، بۆیە ئەدەبی (زەکەریا) بەو جۆرە ئەدەبە لەقەڵەم دەدرێت، کە لەناوجەرگەی سەختیی ژیانەوە سەرچاوەی گرتووە، ئەدەبێکە لەدایکبووی نێوچوار دیواری قوتابخانەو هۆڵەکانی زانکۆکان نییە، سەرچاوەی لە کتێبە تیۆرییەکان وەرنەگرتووە، بەڵکو هەڵقوڵاوی ساتە تاریکەکانی ژیانە.

یەکێك لە شێوازە گرنگەکانی ئەم داهێنەرە، بەمرۆڤکردنی شتەکانە، بەتایبەتی (باڵندەو ئاژەڵ و سروشت و زۆر لەو وشانەی کە پەیوەندییان پێوەیانە)، لەمەدا هەر تەنها مەبەستی ئەوە نییە بمانگەیەنێتە پۆپەی هونەری، بەڵکو مەبەستێتی بەهۆیانەوە تووشی سەرسوڕمانمان بکات و لە سۆزو سەرسوڕمانەوە پاش هێوربوونەوە پرسیاری عەقڵانییانەمان لا بورووژێنێت.

هەر لێرەوە بۆ بەمرۆکردن زۆرجار (زەکەریا) دەگەڕێتەوە بۆ ڕابوردوو سوود لە کەلەپوورو مێژوو دەبینێت، بەرگێکی تر دەکات بەبەری کەسە مێژووییەکاندا (ئیبن مقفع، عومەر موختار، تاریقی کوڕی زیاد... هتد)

(منداڵ) پانتاییەکی زۆر لە چیرۆکەکانی (زەکەریا) داگیردەکات، ئەمیش بەدوو شێوە : یەکەمیان، لەڕێگای ئەدەبی منداڵەوە کە بە زمانی منداڵ دەدوێت و ئاستی بیرکردنەوەیان دەخوێنێتەوە، دووەمیشیان، لەقاڵبی ئەدەبێکدا کە بۆ گەورە دەنووسرێت، بەڵام منداڵ تیایدا سەروەرە، سەروەرییەکەیش بۆ ئەوەیە گەورەکان بە زمان و جۆری بیرکردنەوەی پیاوسالاریی خۆیان ڕووبەڕووی دڵڕەقی و توندوتیژیی و ئەشکەنجەی بکەنەوە و ناخی بشێوێنن، لە دەقی (تامر)یدا بەرائەتی منداڵ دەڕفێندرێت، خەونی هەڵئەوەرێنرێت، هەمیشە گەورەکان، نەك هەر دەسەڵاتدارانی نێوەندی کۆمەڵایەتی و سیاسی، بەڵکو گەورەکانی بواری زانستیش کار بۆ ئەوە دەکەن زەینی منداڵ بشێوێنن، لەجیاتی وشەی جوان مێشکی پڕدەکەن لە وشەگەلێك پەیوەستن بە زانست و زمانێکەوە کە لە توندوتیژییەوە نزیکن، (هەستامە سەرپێ لەکاتێکدا مامۆستا بەتوندی و نارەزاییەوە بەردەوام بوو.. بەس لووتت بەلێوانی کراسەکەت....) وشك بووم، مامۆستاکە وتییەوە: (بەزوویی وەڵامم بدەوە... دە ملیۆن خەڵکمان هەیە، حەوت ملیۆنمان لەدەست دا، چەند لەژیاندا ماوە ؟.. بەزوویی وەڵامم بدەوە) : ((نازانم)).

مامۆستا بەتوڕەییەوە وتی: (ئۆف.. تۆ وەك قوتابییەکی نەخوێندەوار دەمێنیتەوە).

لەچەندین نموونەی لەم جۆرەدا منداڵ دژی وەرگرتنی ئەو چەشنە زانستییە قورس و بێزارکەرانەی گەورەکان دەوەستێتەوە.

دیارترین تیمەی چیرۆکی تامریی (واتە زەکەریا تامر) دەسەڵات و چەوساندنەوەیە، بەڵام دەسەڵاتەکە پەلوپۆ دەهاوێت و بواری زۆر داگیردەکات، بەهۆی ئەمەیشەوە سەرچاوەکەی دەگۆڕڕێت، جاری واهەیە دەسەڵاتدار خەلیفەیە، یان میرە، یان سەرکردەیەکی مێژووییە، یان مامۆستایە و پیشەکەی دەبێت بەگەیاندنی ماریفەی ڕەق و توندوتیژ.

هەرچەندە ئامانجێکی زەقی ئەدەبی زەکەریا، دەرخستنی تراجیدیایە، بەڵام گاڵتەجاڕیی لەلای دەبێت بە شێوازو زمان و وەسیلە.

دەستخۆشی لە مامۆستای چیرۆکنووس (مامۆستا جیهان عومەر) دەکەم و پێموایە ئەمە بۆ دووەم جارە لە دووتوێی کتێبدا چیرۆکی (زەکەریا تامر) دەکات بەکوردی، هەرچەندە دەبوو چیرۆکی ئەم داهێنەرە لەساڵانی حەفتاو هەشتای سەدەی ڕابوردوو بکرابا بەکوردی، ڕەنگە یەکێك لە هۆی وەرنەگێڕانی ئەوە بێت، کە زۆربەی نووسەران و خوێنەرانی ئەو کاتە بەزمانی عەرەبی دەیانخوێندەوە.

وەرگێڕانی ئەدەبی (زەکەریا تامر) پێویستییە، بەتایبەتی بۆ کتێبخانەی کوردی و نەوەی ئێستا، کە زیاتر وەرگێڕانەکە سوودیان پێدەگەیەنێت.

# بەندینخانە

(مستەفا شامی) تامەزرۆی ئاوازی (مەوال) و ئەستێرە و گیای سەوز بوو، بەڵام ماندوو بوو لە دروستکردنی خانوودا، دوای تۆزێك چاوەکانی لێکدەنێ، مردن گوڵێکە لەبەفر، خۆی حەشارداوە لە دەمارەکانیدا، ئەوا ئێستا بەیانییەکەی هات.

بەخۆشییەوە زەردەخەنەیەکی کردو بە بیریدا هات ئەو خانووانەی دروستیکردوون دەبنە کەلاوە دوای نەمانی، کەوتە ڕاکردن بە نێو شەقامە زەردەکاندا، بە هەوادا هاواری دەکرد، بە دەنگێکی پڕ تووڕەو سەرسوڕمان و ئازارەوە، بەو شێوەیە بە زۆر لەخۆکردنەوە دوورکەوتەوە لە ماڵەکان و ئاوازی (مەواویل) و گیای سەوز، دوای چەند کاتژمێرێك لە گۆڕستانێك بە ماڵان چواردەور درابوو نێژرا، (لەمیا)ی خێزانی کەوتە گریان و لاواندنەوە، بەڵام دوایی کە تاریکی شەو داهات لەگریان وەستایەوە، بەتەنیا لەسەر پێخەفێکی پان و بەرین ڕاکشا، پیاوانێکی بەرگ سپی بە خەیاڵدا هات، مێردەکەیان دەبرد بۆ زەوییەکی پان وبەرینی سەوز، ئەو کاتە دڵتەنگی کۆترێك بوو بەرگی ماتەمینی لەبەردابوو، بەترسەوە لەژێر بارانێکی بەلێزمەدا دەفڕی، خەو کە منداڵێکی چاو خەماویی لەخۆگرتبوو گوڵێکی ڕەشی بە دەستەوە بوو لەگەڵ گۆرانییەك لە قەدیفەیەکی گەرم، بەڵام زەنگی دەرگاکە بەبەردەوامی و بەدەنگێکی ناساز کەوتە لێدان، (لەمیا) لەخەوەکەی بەئاگاهاتەوە، سەری لەسەر سەرینەکە بەرز کردەوە، بەپەنجەکانی چاوەکانی هەڵگلۆفت و گوێی هەڵخست، زەنگی دەرگاکە بەردەوام بوو لە لێدان، بە دەنگێکی باوێشکاوییەوە هاواریکرد:

ـــــ ئەوە کێیە !؟

هەر ئەو کاتە دەنگێکی ڕەق و زبر بەشێوەی فەرمانکردن وەڵامی دایەوە و وتی:

+ بیکەرەوە !!

هەستایە سەرپێ و جێگاکەی جێهێشت، بە پێی پەتییەوە کەوتە ڕاکردن بەدالآنەکەدا و لەبەر تیشکی مانگەشەودا، ڕایکرد بەرەو دەرگای ماڵەکە،بەشێوەی پەلەکردنێکی لێوانلێو لەترس و تامەزرۆییەوە دەرگاکەی کردەوە و بینی وا مێردەکەی وەك درەختێکی بێ گەڵا لەودیو دەرگاکەوە ڕاوەستاوە و بە کفنێکی سپی خۆی پێچاوەتەوە.

(مستەفا شامی) بە ڕوویێکی گرژو مۆنەوە هاتە ژوورەوە، ڕوویکردە (لەمیا) و وتی:

+ دەرگاکە بەباشی داخە، لەم ڕۆژەدا دز زۆرە !!.

(لەمیا)ش بەقسەی کرد، بەباشی دەرگاکەی داخست و دوای مستەفا کەوت بۆ سەر جێگای نووستن.

﴿مستەفا لەسەر جێگاکە ڕاکشا﴾ و بەدەنگێکی ماندووەوە بە (لەمیا)ی ژنی وت:

+ ڕووناکی دامەگرسێنە با ژوورەکە تاریك بێت.

بۆ ماوەیەك بێدەنگ دەبێت و دواتر لە ژنەکەی دەپرسێت:

+ نووستبوویت !؟؟.

(لەمیا) وەڵامی ناداتەوە و پاشان لەپاڵ مستەفادا بەدەم هەناسەبڕکێوە ڕادەکشێت، مستەفاش باوەش دەکات بە (لەمیا)دا و بەگاڵتەکردنەوە دەڵێت :

+ گەرمم بکەرەوە !!.

دەنگی مستەفا دەگۆڕێت و خۆشییەکەی وندەکات و دەنگی دەبزرکێت، بەترس و بێتاقەتی و دڵەڕاوکێوە دەڵێت:

+ نەمتوانی لەوێ بنووم !!.

(لەمیا) ویستی قسەبکات، بەڵام لەو کاتەدا دەمی وەك بەردێکی ڕەقی لێهاتبوو، مستەفا قسەدەکات، دەنگی باڵندەیەکی ڕەش بەقوڕ سواغ درابوو:

+ بەختەوەر بووم بەوەی گۆڕستانەکە دوور نەبوو لە ماڵەوە، لەڕێگا تووشی هیچ پۆلیسێکی ئێشکگر نەبووم، چەندە بەزەیم بەوانەدا دێتەوە لەگۆڕستانێکی دوور لە ماڵەکانیان دەنێژرێن، لەبەرئەوە ناچارن لەگۆڕستانەکەدا بنوون.

دەنگی مستەفا لەسەرخۆ کزدەبێت و بڵاودەبێتەوە، پاش تۆزێك (لەمیا) بەتەنیا دەمێنێتەوە و لەسەر جێگاکە چاوەکانی دەبڕێتە بنمیچەکە،

لەپڕێکدا تێڕوانینەکەی پڕدەبێت لە ترس، چونکە بەتوندی لەدەرگا دەدرێت، دەستبەجێ خۆی دەبینێتەوە بەرەو دەرگاکە ڕادەکات، بە دوودڵیی و نیگەرانییەوە دەرگاکە دەکاتەوە، دوو پۆلیس دەبینێ بەبەرگی سپییەوە، یەکێك لە پۆلیسەکان ڕووی تێدەکات و دەڵێت :

+ مستەفا شامی مێردت لەکوێیە!!؟؟ بۆچی ڕێگات پێداوە بگەڕێتەوە و لێرە بنوێت !؟ ئایا نازانیت ئەم کارەت سەرپێچی یاساییە ؟؟

هەردوو پۆلیسەکە هاتنە ناو ماڵەکەوە، یەکسەر بەرەو ژوورەکە ڕۆیشتن، بەدەم چوونە ژوورەوەوە تووڕە دەبوون و نارەزاییان دەردەبڕی، هەر کە مستەفایان بینی کەوتنە جوێن پێدانی، مستەفاش بەترسەوە هەستا و کەوتە پاڕانەوە، هەردووکیان گوێیان بە پاڕانەوەکەی مستەفا نەدا، لەسەر پێخەفەکە دایانگرتە خوارەوە، وەك پارچە تەختەیەك هەڵیانگرت و لەماڵەکە چوونەدەرەوە، لەگەڵ ئەوەشدا لەبێدەنگی ئەو شەوەدا گریانی زۆرتر دەبوو و دەنگیشی بەرزتر دەبووەوە و کۆتایی نەدەهات.

ئەوەندەی پێنەچوو بێدەنگیی باڵی کێشایەوە بەسەر ماڵەکەدا، (لەمیا) چووەوە سەرپێخەفەکە و ڕاکشایەوە، بەڵام ماوەیەکی پێچوو هەستایەوە و ڕووناکییەکانی داگیرسانەوە، لەبەردەم ئاوێنەکەدا ڕاوەستا، سەیرێکی سیمای خۆی کردو زەردەخەنەیەك گرتی و ڕووناکییەکانی کوژاندەوە و چووەوە سەر پێخەفەکەی ڕاکشایەوە و چووە خەوێکی قووڵەوە، بەڵام سیمای هێشتا زەردەخەنەکەی پێوە دیار بوو.

(مستەفا شامی) ئەو کاتە لەبەردەمی دادوەرێکی ڕووخۆشدا ڕاوەستابوو، سیمای چرچ ولۆچ بوو، تەمەنی هەزارەهاساڵی دەنواند، دادوەر تاوانی هەڵاتنی دایەپاڵ مستەفا، مستەفاش هیچ وەڵامێکی پێنەبوو، تەنیا ئەوە نەبێت، کە وتی :

+ گۆڕ جێگایەکی شیاو نییە بۆ مرۆڤ !!

دادوەرەکە پێکەنی و بە دڵخۆشییەوە حوکمەکەی دا بەسەریدا.

دوای ئەوە پیاوە بەرگ سپییەکان هەستان و مستەفایان برد بۆ زەوییەکی بەرینی سەوز، لەوێ پێیان وت، کە دەبێت کاربکەیت لە دروستکردنی کۆشکدا، ئەمیش هیچ وشەیەکی لەدەم نەهاتە دەرەوە، هیچ هات و هاوارێك و پاڕانەوەیەکی نەکرد و سەیریکرد وەك ئاژەڵێك گوێی لەداخستنی دەرگای قەفەزەکە بوو، چاوەکانی چاوی دوو منداڵی سەربڕڕاو بوو... لەو کاتەدا زەوی وشك و زەوی سەوز یەك ئاسمانیان هەیە لە ئاسنی پۆڵا دروستکراوە.

# بـــــاز

باوکم پێش ساڵێك ئەمری خوای کرد، ئەمڕۆ دەچم بۆ دیداری، لەنێوان گۆڕە سپییەکاندا دەوەستم و ترس و دڵتەنگی و شکانەوە نیشان دەدەم، بەدەنگێکی ملکەچی سوورەتی (فاتیحە) دەخوێنم و پێشکەش بە گیانی باوکمی دەکەم، گوێم لێیە بە تووڕەییەوە دەقیژێنیێ:

– کوڕم.. تەریق بەرەوە... بەسە جگەرەکێشان.

تێکدەچم، جگەرەکەی دەستم فڕێ دەدەمە سەر زەوی و بە پاژنەی پێڵاوەکانم پانیدەکەمەوە، کەچی باوکم هەر دەنەڕێنیێ و پرسیار دەکات و دەڵێت :

– ژنت هێناوە !؟

منیش بەسەرسوڕمانەوە وەڵامم دایەوە:

+ بۆچی ژن بێنم !؟

بەهەڵەشەییەوە پێم دەڵێت :

– کوڕ.. جوانیی ژیانی دونیایە !!

بە بەرهەڵستی و پێداگرییەوە پێم وت :

+ ژن ناهێنم و نامەوێت ببم بە باوك !!

باوکم تووڕەدەبێت و دەقیژێنیێ، منیش بەپەلەو بەخۆشییەوە پێم وت :

+ باوکە.. تۆ زویر مەبە، زویریی زیانی بۆ تەندروستیت هەیە.

ئەو توورەدەبێت و زیاتر دەقیژێنێت، منیش بەڕاکردن لەگۆڕستانەکە هەڵدێم و دەگەڕێمەوە بۆ ماڵەوە، لەوێ دەبینم خۆشەویستەکەم بە خۆشیەوە لەسەر جێگاکەی ڕاکشاوە و چاوەکانی لەیەکناوە، داوام لێکرد گۆرەوییەکانم بۆ بشوات، ڕازینەبوو بەبیانووی ئەوەی ماندووە، منیش بێئەوەی دەستم بلەرزێ سەرمبڕی و ڕۆژم لە ئاسماندا دەرکرد و بەتەنیا لەسەر زەوی مامەوە، خوێنبەرێکی ڕەنگ ڕەش دەمی نییە هاواربکات لەشەوێکی تاریکدا جێ پێی ئەسپە.

کە ڕۆژ بووەوە بەتامەزرۆییەوە چوومەوە بۆ گۆڕستانەکە کەچی باوکم بە بێدەنگیی وەستابوو، ناچاربووم بەپشت شکاوی گۆڕستانەکە جێبهێڵم، بەهەنگاوی ماندووانە بەشەقامەکاندا دەگەرام، وەك پیاوێکی لاواز، لە خوێنبەرەکانیدا حەزێکی توند دەلەرزێ بۆ مۆسیقا و دەریا، بەڵام پیاوانی پۆلیس ئەوانەی حەزیان لە مۆسیقا نییەو ڕقیان لە دەریایە، یەکێك لەوانە ڕێگای پێگرتم، بەدەنگێکی تیژو زبرەوە وتی :

— تۆ.. سووکایەتی بە وڵات دەکەی !؟.

ئەو کاتە زانیم منداڵان بەتەنیا لە پۆلیس ناترسن، بەدەنگێك کە هەوڵمدا بزرکاندنەکەی بشارمەوە وتم :

+ من.. چیم کردووە !!؟؟

ئەویش پێی وتم :

— پشتت.. پشتی چەماوەت زیان بەنیوەی وڵات دەگەیەنێت، تەنیا برسی و نەخۆشەکان وەکو تۆ دەڕۆن بەڕێوە.

+ ڕاستە من برسی و نەخۆشم !.

— هەی بێشەرم.. دەڵێی برسی و نەخۆشم !؟ ئەم قسەیە تەواو هێرشە بۆ سەر دەوڵەت !!.

+ ببوورە، ببوورە... مەبەستم ئەوە نییە هێرش بکەمە سەر کەس.

بەپەنجە درێژەکانی ئاماژەی بۆ ڕووم کردو وتی :

— سیمات !!

+ سیمام.. چییەتی !؟

-      بڕوانه ئاوێنه سیمات گرژه ! بۆچی ؟

+ لەبەر ئەوەی بێکارم  !!

-      بێدەنگ بە.. چۆن دەوێریت ڕەخنه لەیاسا بگریت  !؟

+ من  !؟

-      بێدەنگ بەو دەمت داخه و لەبەرچاوم نەمێنیت و بە شەقامەکانیشدا نەڕۆیت  !.

بەزوویی ڕۆیشتم هەنگاوی ئاژەڵێکی دەرکراوم دەنا بەرەو ماڵەوە، درەختی شەقامەکان زەرد بوون، ڕووتەن بوون لەگەڵا و مەل، مەلەکان ڕەویان دەکرد و لە تیاترۆکانی شەودا کاریان دەکرد، لەکاتی ڕۆیشتنم دا ئافرەتێکم بینی پرسیاری لە منداڵێکی بچووك دەکرد، کە هۆکاری گریانەکەی چییە ؟ منداڵەکەش وەڵامی دایەوە و وتی :

++ منداڵان لێیانداوم  !!

ئافرەتەکەش دەستی هێنا بەسەریدا و بە سۆزێکەوە پێی وت :

بەسە، مەگری.. ئەوەی لێی دایت لێی بدەوە  !!.

جۆرێك لە خۆشی باڵی کێشا بەسەر منداڵەکەدا، ئەو هەڵۆیەی لەماڵی هەژاراندا دەژی ڕۆژێك لە ڕۆژان سەردەکەوێ بۆ سەرەوە و دەبێتە خاوەنی ئاسمانی شار، بەڵام خۆشی من لەپاش تۆزێك کوژایەوە، چونکە پیاوانی پۆلیس دەستگیریانکردم، لەبەرئەوەی لە شەقامەکەدا باوێشکم دا، بردمیان بەرەو دادگا، لەوێ دادوەر پرسیاری لێکردم و وتی :

(( بەڕاستی تۆ باوێشکتدا  !؟؟))

ئەو کاتە خۆر لەدەرەوەی دادگا بوو، مەلێکی خاوەن دوو باڵی زیوین بوو، باوێشکمدا، بەدادوەم وت :

+ بەڵێ.. باوێشکم دەدا  !

دادوەریش بەتووڕەییەوەی وتی :

((کەواتە حەزت لەچییە داوای بکە))

منیش پێم وت :

+ حەزم لە هیچ شتێك نییە.

دادوەر نێوچاوانی خۆی بە دەستەسڕێکی ئاوریشمینی سڕییەوە و دوای ئەوە بڕیارەکەی خۆی خوێندەوە، ئەو کاتە هۆڵی دادگام جێهێشت، هاوکات ژمارەیەك لە پیاوانی پۆلیس چواردەوریان گرتبووم، ئۆتۆمبێلێك چاوەڕوانی دەکردم،

که لە تابووتێکی لەتەختە دروستکراوی کۆن دەچوو، گواستمیانەوە بۆ ڕۆخی ئەوبەری یەکێك لە حەوت ڕووبارەکە، لەوێ پیاوانی پۆلیس بە پەت شەتەکیان دام و دوو بەردی گەورەیان بە قاچمەوە بەستەوە، پاشان فڕێیان دامە بنەوە و چاوو دەمم نووقاندبوو، هەوڵم دەدا شارێکی سووتاو لەژێر ئاسمانی سەوزو مانگی ڕەشدا بهێنمە بەرچاوی خۆم، کاتێك دەمم هاواری دایکمی کرد کە بەهانامەوە بێت، ئاو هاوارەکەی خنکاندم، ناچاریکردم بێدەنگ بم، بەو شێوەیە بێبەشبووم لە باوێشکدان، خۆرم بەجێهێشت، لەدووی خۆمەوە بۆ ئەوەی هەموو ڕۆژێك هەڵبێت.

# ئەوەی کەشتییەکانی سووتاند

## 1 / گرتووخانە:

درەختە سەوزەکان لە گۆرانی وتن وەستان لەو کاتەی ژمارەیەك لە پیاوانی پۆلیس بە ڕوویێکی گرژەوە دەیانڕوانییە ئەو پیاوانەی بە پیادەڕەوەکاندا وەك شێرێکی پیر هاتووچۆیان دەکرد، تیرێکی ماندوو کاتی ئەوەی هاتبوو بچێتە نێوچەوانەوە، دوای هەزارەها سەرکەوتن لە جەنگەکاندا، یەکێك لەوانە دەست پێشخەریکرد و بەشێوەیەکی ناشیرین وتی :

– پێناسەکەتمان بدەرێ !.

پیاوەکە قسەی پۆلیسەکەی بەنیگەرانیەوە وەرگرت، خەریك بوو تەسلیم بێت بە بێزارییەکی دژایەتییەوە، بەڵام ڕازیبوو و بە زەردەخەنەیەکی بەرزخوازییەوە دەستیبرد بۆ گیرفانی و پێناسەکەی دەرهێنا، دایە دەست پۆلیسەکەو ئەویش بەپەلە لێی وەرگرت و چاوێکی پێداخشاندو سەیری پیاوەکەی کردو لێی پرسی :

– کەواتە تۆ.. تاریقی کوڕی زیادی !؟

پیاوەکە بە شانازییەوە وتی :

+ بەڵێ.. !!

– دەفەرمووی لەگەڵماندا بێیت ! ؟.

+ بۆ کوێ ؟؟

– بۆ پۆلیسخانە !!.

+ پۆلیسخانە !! بۆچی !؟

– داواکراوی بۆ لێکۆڵینەوە !!

+ من ! ؟ من.. تاریقی کوڕی زیاد! ؟

– گرنگ نییە بەلامانەوە تۆ کێی؟، تۆ ئێستا پیاوێکیت فەرمان پێماندەڵێت، کە بە زیندوویی یان مردوویی دەستگیرت بکەین.

تاریقی کوڕی زیاد ناوچەوانی گرژکردو خوێن لە دەمارەکانیدا بەتوندی و وەك بروسکەیەکی تیژ هاتووچۆی دەکرد، بەلایەوە گرنگ نەبوو بکەوێتە ڕۆشتن تاوەکو پیاوانی پۆلیس چوار دەوریانگرت و قۆڵبەستیان کرد، هەوڵیدا خۆی لەدەستیان ڕاپسکێنێ، بەڵام بەتوندی کەوتنە لێدانی تاوەکو ناچاریانکرد بەرەنگاری نەکات، کەوتە سەرزەوی و تەریقی و خوێن گەمارۆیاندا.

## 2 / **لێپرسینەوە** :

لەڕۆژی یەکەمدا برسێتی دروست بوو.

لەڕۆژی دووهەمدا مۆسیقا دروست بوو.

لەڕۆژی سێهەمدا کتێب و پشیلە دروست بوون.

لەڕۆژی چوارهەمدا جگەرە دروست بوو.

لەڕۆژی پێنجەمدا چایخانە دروست بوو.

لەڕۆژی شەشەمدا تووڕەیی دروست بوو.

لەڕۆژی حەوتەمدا چۆلەکەو لانە شاراوەکانیان لەنێو درەختەکاندا دروست بوو.

لەڕۆژی هەشتەمدا لێکۆڵەرەوەکان دروست بوون، ڕاستەوخۆ چوون بۆ شارەکان و لەگەڵیاندا پیاوانی پۆلیس و بەندینخانەو کەلەپچەی ئاسنین دروست بوون.

– تاریقی کوڕی زیاد... تۆ تاوانباری بە بەفیڕۆدانی کەلوپەلی دەوڵەت !!.

+ ئێوە هەڵەن، من هیچ کەلوپەلێکم بەفیڕۆ نەداوە.

– تۆ.. کەشتییەکانت نەسووتاند !؟

+ سووتاندنی کەشتییەکان بەمەبەستی بەدەستهێنانی سەرکەوتن بوو.

– نامانەوێ گوێمان لە بیانووهێنانەوە بێت، تەنیا وەڵامی پرسیارەکانمان بدەرەوە، کەشتییەکانت سووتاندووە یان نەء !؟؟

+ من کەشتییەکانم سووتاندووە.

– کەواتە بەبێ ڕەزامەندی سووتاندووتە ؟،... بۆچی وەڵام نادەیتەوە ؟ ڕەزامەندی سەرۆکەکانت وەرگرت بۆ سووتاندنی کەشتییەکان ؟

+ کەواتە جەنگ جیاوازە وەك قسەکردن لەچایخانەوە شەقامەکان !!.

تاریقی کوڕی زیاد بەچاوێکی پڕ لە نارەزایی و تووڕەیی بەرامبەر بە لێکۆڵەرەوەکان کە چواردەوریان گرتبوو، زۆر لەسەرخۆ پێی وتن :

+ ئێوە لە کاتی جەنگدا لەکوێ بوون !؟.

– ئێمە کاری خۆمان دەکرد!.

+ ئێمەش چەکمان هەڵگرتبوو !.

تاریقی کوڕی زیاد بەدەنگێکی هەڵەشەییەوە قیژاندی و وتی :

+ ئێوەش چەکتان هەڵگرتبوو و دانیشتبوون لەسەر کورسی و پشتی مێزەکانتانەوە چاو قاوەتان دەخواردەوە و باسی نیشتمان و ئافرەتتان دەکرد!.

لێکۆڵەرەوەکان کەوتنە پێکەنین و دەنگیان بەرزکردەوە و قاقایان لێدەدا و پێیان وت :

– تۆ.. ناپاکیت !!، سووتاندنی کەشتییەکان لێدانێکی جەرگبڕ بوو بۆ هێزەکانی نیشتمان ، کێ سوودی وەرگرت لەسووتاندنی کەشتییەکان تەنیا دوژمن نەبێت !؟ دەی قسە بکە بێدەنگیی سوودی نییە بۆت. ئێمە بەڵگەمان لایە کە ناپاکیت دەسەلمێنێ و یارمەتی دوژمنت داوە.

+ گەل دەزانێت چۆن تۆڵە لە ناپاکان دەکاتەوە !.

دەریاو دوژمن هێرشیانکرد، تێکەڵ بوون بە قیژەی پیاوێك

((دەریا لە پشتانەوەیەو دوژمن لەبەردەمتانایە))، تاریقی کوڕی زیاد بەهەڵچوونەوە قیژاندی :

+ بەڵام من دوژمنم شکاند!.

پێیان وت :

- ئەوەی دەیڵێیت پەیوەندی نییە بەو تاوانەی ئاراستەت کراوە!.

### 3 / پرۆژەی مارەبڕی :

بۆ ئەوەی ئازادی وسەربەستی بەردەوام بێت لە نیشتمان، ئەی نیشتمانپەروەران.. بەشەرەف بژین، سەدەها ساڵ بێ نان، ژیان بێ سەربەستی، ژیان بێ کەرامەت، زەردەخەنەتان لەبیرچووەوە، ڕقتان لەگوڵ و مانگ و گۆرانی و دڵداری دەبووەوە، ئەمڕۆ خوا نیشتمانی بەنرخمانی پاراست لەدوژمنان و لە پیلانگێڕان.

### 4 / خنکاندن :

ئەستێرەکان ڕایانکرد، ئەوا ئێستا هاتنەوە، دەرگای بەندینخانەیان کردەوە و مشکی برسییان کردە ژوورەوە، سەریان لەوە سوڕنەما، کە ڕوانییان تاریقی کوڕی زیاد لاشەیەکی ساردە، بەڵکو پەلەیانکرد بۆ گواستنەوەی بۆ گۆڕەپانی شار، لەوێ تاوانەی خنکاندنیان خوێندەوە، دوایی پرسیاری دوا حەزیان لێکرد، ئەویش هیچ وشەیەکی نەدرکاند، ئەوانیش بێدەنگییەکەیان بەوە دانا کە نیشانیاندا بۆ حەزلێنەکردنی مانەوەی، دوای ئەوە بە پەتەکەوە شۆڕبووەوە.

### 5/ لەهاووڵاتییەکی نموونەییەوە :

بۆ بەڕێز بەڕێوەبەری پۆلیس :

بۆ جێبەجێ کردنی فەرمانەکانتان، تکایە ڕێگامان پێ بدەن بۆ مردن !!.

# تـــــــاوانبار

پۆلیسێکی قەڵەو چووە نێو گۆڕستانەکەوە، بە دوودڵییەوە هەنگاوی نا لەنێو گۆڕە سپییەکاندا، دواتر بۆ ماوەیەك بە دوودڵییەوە وەستا، دوای ئەوە بە دەنگێکی بەرز بانگی کرد :

– عومەر خەیام !!.

کەس وەڵامی نەدایەوە، دەستەسڕێکی سپی پیسی لەگیرفانی دەرهێنا، چڵمەکەی پێ سڕی و قەدیکردو خستییەوە گیرفانی، بەدەنگێکی نارەزاییەوە قیژاندی :

– عومەر خەیام.. عومەر خەیام.. تۆ داواکراوی بۆ دادگاییکردن !!.

کەس وەڵامی نەدایەوە، پۆلیسەکە لە گۆڕستانەکە گەڕایەوە بۆ پۆلیسخانە، لەوێ ڕاپۆرتێکی نووسی، ئەوەی بینیبووی تیای نووسی و جەختیکردەوە لەسەر ئەوەی (عومەر خەیام) ڕەتیکردوەتەوە کە ئامادەی دادگا بێت.

ڕاپۆرتەکەی پێشکەش بەسەرۆکەکانی کرد، ئەوانیش نێوچەوانیان گرژکردبوو، بەنارەزایی و سەرسوڕمانەوە دەستیان کرد بەدەرکردنی فەرمانەکانیان، ژمارەیەك لە پیاوانی پۆلیس بەرەو گۆڕستانەکە بە (پاچ و خاکەناز)ەوە کەوتنە ڕێ، گۆڕی (عومەر خەیام) یان هەڵدایەوە و لەژێر خۆڵەکەدا دەریانهێنا، بە پارچەپارچە کراوی گۆشتەکەیەوە هەڵیانگرت بۆ هۆڵی دادگا و بۆ بەردەمی دادوەر.

دادوەر بە زمانێکی سەنگین و قورسەوە وتی :

+ تۆ.. عومەر خەیام، تاوانباری بە نووسینی شیعری پیاهەڵدان بەسەر (مەی)دا، داواش دەکەی بخورێتەوە لەبەرئەوەی وڵاتمان لەهەوڵی وەدیهێنانی سەربەخۆیی ئابووریدایە و یاساکانی قەدەغەکردنی هاوردەی کەلوپەلی بێگانە دەکات، لەبەر ئەوەی وڵاتەکەمان شانازی دەکات بەکارگەکانی دروستکردنی (مەی) یەوە، لەبەر ئەو هۆیانە شیعرەکان دادەنرێن بە هۆکاری هاندان بۆ داخوازی هاوردەی کەلوپەلی بێگانە، یاساش سزای توندوتیژی بۆ ئەوە داناوە، تۆ.. داندەنێیت بە تاوانەکەتدا !؟،

بۆچی وەڵام نادەیتەوە ؟، قسەبکە !! بێدەنگیی ئازارت دەدا... باشە کەواتە بێدەنگیت سەرچاوەی ڕازینەبوونە بە تاوانەکەت !!، کەواتە هەوڵدەدەین بزانین ئایا تۆ بێتاوانی یان تاوانباری، ئێمەش مەبەستمان دادوەریی ڕاستەقینەیە... یەکەم : ئەوەی شیعر دەنووسیّ دەبێت نووسین و خوێندنەوە بزانێت، تۆ نووسین و خوێندنەوە دەزانیت ؟؟، تۆ خۆتی لیّ هەڵە دەکەیت ؟... کەواتە شاهیدەکان بانگ دەکەین !!.

شاهیدی یەکەم (خاوەنی کتێبخانە) : تاوانبار ژمارەیەکی زۆر کتێبی لە کتێبخانەکەی من دەکری.

دادوەر: چ جۆرە کتێبێکی دەکڕی ؟.

شاهیدی یەکەم : کتێبی هەمەجۆرو بابەتی جیاوازی دەکڕی ، بەڵام ئەو کتێبانەی بەچاك دەزانی کە باسی دڵداریان دەکرد.

دادوەر : ئیّ ئیّ... کەواتە حەزی لەکتێبی جنسی بووە، ڕەحمەت لە ڕەوشتی جوان، پێم بڵیّ کتێبی سیاسەتی نەدەکڕی ؟؟.

شاهیدی یەکەم : کتێبی سیاسی !؟، سوێند ئەخۆم ڕۆژێك لەڕۆژان دەستم بەر کتێبی سیاسی نەکەوتووە، لەوانەیە لە کتێبخانەی تر کڕیبێتی !.

دادوەر : کەواتە کتێبی دەکڕی.

شاهیدی یەکەم : پەڕەی سپی و قەڵەمیشی دەکڕی.

دادوەر : ئەڵڵاهوئەکبەر.. نارەوا لەنێوچوو، حەق سەرکەوت، تاوانبار ئەگەر خوێندن و نووسینی نەزانیایە چۆن پارەی خەرج دەکرد لە کڕینی کتێب و قەڵەم دا ؟.

شاهیدی دووهەم (پیرێژنێك) : ئەوەی ئاگادارم تاوانبار حەزی لە (وشە) بوو، ئافرەتێك کە حەزی لێی بوو دەیوت ئەمە زیاتر حەزی لە (وشە)یە وەك لە جوانی ئافرەتێك لە ژیاندا !!.

دادوەر : حەزی لە (وشە) بوو !؟؟ بەڕاستی ئەمە ناباوییە !، هاووڵاتی چاك تەنیا دایکی و حکومەتی خۆشدەوێت.

شاهیدی سێهەم (ڕۆژنامەنووس): شیعرەکانی ئەم تاوانبارەم دیوە، دەبینم هیچ پیاهەڵدانێکی جوانی بەسەر حکومەتدا تیا نییە.

دادوەر: ئەمە بەڵگەیەکی تەواوە کە تاوانبار حەزی لە گەل نییە.

شاهیدی چوارهەم (پیاوێکی ڕیش درێژ): سوێند ئەخۆم بە خوای گەورە، بەو گوێیانەی خۆم کە دوای مردن کرم دەیانخوات، گوێم لێبوو، ئەم تاوانبارە دەیوت : (مەی) دڵتەنگیی دەرەوێنێتەوە !.

دادوەر : ئەم قسەیە زۆر ترسناکە، ئەگەر بۆ دادگا چەسپا دڵتەنگیی لەنێو خەڵکیدا بڵاوبووەتەوە.

شاهیدی پێنجەم (سەرۆکی پۆلیسخانە): ژمارەیەکی زۆرمان ڕاپۆرت بۆ هاتووە، کە دەڵێن ئەم تاوانبارە چالاکی ڕووخێنەری هەیە بۆ دڵتەنگیی، بەڵام سەرکەوتوو نەبووین لە گرتنیدا و تاکو ئێستا بە دوایدا دەگەڕێین.

شاهیدی شەشەم (زیندانییەك ): دڵتەنگیی هانیدام داوا بکەم بەسەربەستی بژیم.

شاهیدی حەوتەم (زیندانییەکی تر): دڵتەنگیی وایلێکردم جوێن بە حکومەت بدەم.

شاهیدی هەشتەم (زیندانییەکی تر): دڵتەنگیی پاڵی پێوەنام بەشداری خۆپیشاندان بکەم.

شاهیدی نۆهەم (زیندانییەکی تر): دڵتەنگیی هانیدام هەوڵبدەم لە بەندینخانە هەڵبێم.

شاهیدی دەهەم (زیندانییەکی تر): تەنیا دڵتەنگیی وایلێکردم ڕقم لەپیاوانی پۆلیس بێتەوە.

دادوەر: لێدوانی شاهیدەکان چەسپاندی کە شیعرەکانی (عومەر خەیام) تەنیا پڕوپاگەندەیەکی ئاشکرایە بۆ (مەی)، داوایەکی بێ مانایە بۆ هاوردەکردنی کەلوپەلی بێگانە، بۆ جێبەجێکردنی نەخشەیەکی گومانلێکراو بۆ ئاراستەکردن و ورووژاندنی ئاژاوە،

هەروەها لێدوانەکانی شاهیدەکان چەسپاندی کە (عومەر خەیام) هانی دڵتەنگیی دەدات، ئەمەش بۆ دادگا ئاشکرابوو، تەنیا سیخوڕییەکە لەپێناو سیخوڕیی تابووری پێنجەمدا، دوژمنەکانمان بەکاری دەهێنن لەپێناو تێکدانی ئاسایش و بڵاوکردنەوەی ناجێگیریی.

دادوەر بۆ ماوەیەك هەناسەیدا و بێدەنگ بوو و بە ئاسوودەیی وخۆشییەوە، دوای ئەوە کەوتەوە قسەکردن، حوکمی (عومەر خەیام)ی دا بە قەدەغەکردنی نووسینی شیعرەکانی بە تەواوی.

پیاوانی پۆلیس (عومەر خەیام)یان گواستەوە بۆ گۆڕستانەکە و گێڕایانەوە بۆ نێو گۆڕەکەی و خۆڵیان کرد بەسەریدا و پاشان هەرچییەك پەڕەو نووسین و قەڵەمی هەبوو هەموویان لەناوبرد، بەڵام دڵتەنگیی بەرەڵڵا و ئازاد بوو و بەدووی چالاکی ڕووخاندنەوە بوو.

# ڕیش

بالّندەکان لەئاسماندا هەڵفڕین، لەگەڕەکەکەماندا منداڵان لەیاریکردن وەستانەوە، گۆرانی چۆلەکە بەندەکان لەقەفەزدا بوو بە هەناسە وەرگرتنێکی دامرکاوەی لەرزۆك، لۆکەی پاکژکراو لە دەرمانخانەکاندا شاردرایەوە، ئێوە ئەی سوپای (تەیموری لەنگ)چواردەوری شارەکەمانتان گرتووە، بەڵام ڕۆژ هیچ ترسێکی بەرنەکەوتووە و هەموو ڕۆژێك هەڵدێت.

ئێمەی پیاوانی شار ڕوومان زەرد هەڵنەگەڕاوە، بەڵکو بەوپەڕی تواناوە زەردەخەنە دەکەین، لەخوا بەزیادبێت وەك پیاوی خاوەن ڕیش دروستی کردووین، وەك ئافرەتی بێڕیش دروستی نەکردووین، دوایی کۆبوونەوەیەکمان سازکرد بۆ لێدوان لە ڕزگاربوون، یەکەم قسەکەر گەنجێکی بەتوانا کاری فرۆشتنی بەرگی ئافرەتان بوو، بەپەرۆشەوە هاواریکرد:

- با شەڕ بکەین.

تێڕوانینی ناڕەزایی کەوتەسەر، بێدەنگ بوو، لە تەریقیدا ڕووی سوور هەڵگەڕا، ئەوکاتە خاوەنی گەورەترین و زۆرترین ڕیش لەشارەکەماندا هەستا بە شەرمەوە کەوتە قسەکردن ووتی:

+ ئێمە پێویستیمان بە شەڕ نییە، تەنیا ئەوانە نەبێت کە ئامادەن، ئێمە سوپاس بۆ یەزدان خاوەن ڕیشەکان کەواتە ئێمە هەین.

بەزوویی لەگەڵ خۆیدا دەنگی پشتیوانیش بەرزبووەوە، پاش وتوویژێکی کورت بڕیار درا نوێنەران پێکبهێنرێت بۆ گفتوگۆ لەگەڵ (تەیموری لەنگ) بەسەرۆکایەتی پیاوێکی پیری ڕیشدار، کە لە کاتی ڕۆیشتندا بە ئەژنۆکانیدا بدات.

شارەکەمان حەوت دەرگای هەبوو، نێرراوەکان لە دەرگایەکیانەوە چوونەدەرەوە، ئاڵایەکی سپی لە پێشیانەوە بوو، لەنێوان سەربازەکاندا ڕۆشتن،
کە ژمارەیان لە ژمارەی ئەستێرەو کوللە زیاتر بوو، سەرقاڵی گەڕان بوون بە دوای ئەسپێدا لەبەرگەکانی ناوەوەیان، شیرەکانیان لەبەر ڕۆژدا دانابوو، بۆ ئەوەی ئەو خوێن و قوڕەی پێوەی بوو وشك بێتەوە.

نێرراوەکان بە هەنگاوی شکۆداریی و لەسەرخۆیی چوونە ناو چادرەکەی (تەیموری لەنگ)ەوە، (تەیموری لەنگ) مێردمنداڵێکی تەمەن بچووك بوو، چاوەکانی چاوی منداڵێك و زەردەخەنەکەیشی زەردەخەنەی پیاوێکی پیر بوو، سەرۆکی نێرراوەکان ڕووی تێکردو وتی:

++ ئێمە ئاشتیخوازین، شارەکەمان بۆ تۆیە بەبێ جەنگ، بەڵام شارەکەمان بچووك و هەژارە، نە ئاڵتوونی هەیە نە نەوت، ئافرەتەکانمان وەك بزن وان، پێخۆشحاڵین ڕزگارمان بێت لە دەستیان.

تەیموری لەنگ: من ڕقم لە خوێن ڕشتنە، نە ئاڵتوونم دەوێ و نە ژنی جوان، بەڵام وەك زانیومە سەرتاشەکانتان لەشارەکەتاندا برسیانە، بەهۆی پێداگرتن لە نە تاشینی ڕیشەکانتان، ئەمە زوڵمەو بەتایبەتی لێی نارازیم، من هەموو ژیانم تەرخانکردووە بۆ پاراستنی زوڵم لێکراوان و بڵاوکردنەوەی داد لە هەموو وڵاتدا پێویستە مرۆڤ برسی نەبێت.

نێرراوەکان لەم وتەیە سەریان سووڕما، سەیری یەکتریان دەکردو تێڕوانینی سەرسام بوونیان دەگۆڕییەوە.

تەیموری لەنگ : سوپاکەم لەشارەکەتان دەرناچێ هەتاکو هەمووتان ڕیشتان نەتاشن، بۆ ئەوەی کاری سەرتاشەکان گەشەبکات و پەرەبستێنێ.

سەرۆکی نێرراوەکان: ئەوەی داوای دەکەیت کارێکی مەحاڵ و ترسناکە، لەبەرئەوە پێویستە بگەڕێینەوە بۆ شارەکەمان پێش ئەوەی دوا وەڵام بدەینەوە.

تەیموری لەنگ : یان ئەوەتا ڕیش دەتاشن، یان لەناو دەچن، خۆتان سەرپشك بن.

ترس و بێدەنگیی باڵی بەسەر نێرراوەکاندا کێشا، لەو کاتەدا ژیانیان زۆر لەلا خۆشەویستتر بوو، ئاسمان قووڵ و شینە، گوڵی سوور لە مەواویلی دەنگی عاشقێکی ئازارچەشتوو جوانتر بوو، قیژەی یەکەمی منداڵان کە بەخوێن دەڕوێت گیایەکی سەوزە، دەمی ئافرەتێکی لەرزۆك مانگێك شەوانە بە چەقۆیەکی ئاڵتوون سەردەبڕی، بەڵام ئەندامانی نێرراوەکە خۆیان وا دەهاتە بەرچاو لەبەر ئاوێنەیەکدا وەستاون و دەڕواننە خۆیان ڕیشیان تاشراوە، نارەزایی و تووڕەیی باڵی کێشایەوە بەسەریاندا، ئەو کاتە مردن بوو بە ماسییەکی سوور دەبریسکایەوە لەژێر خۆرێکی ئاڵتوونیدا.

سەرۆکی نێرراوەکە کەوتە قسەکردن و هەستی دەکرد پیاوی شارەکە بە کڕنووشبردنەوە گوێی لێدەگرن، بە دەنگێکی ساردوسڕەوە وتی :

((بەیانی شارەکەمان دوارۆژی خۆی دیاری دەکات)).

نێرراوەکان گەڕانەوە بۆ شارەکەمان، بەگوێی خۆمان گوێمان لێبوو ئەوەی (تەیموری لەنگ) وتبووی، تووڕەیی باڵی بەسەریاندا کێشا، یەکێك لەئێمە قیژاندی :

(( چ سوودێکی هەیە ژیانمان بردەوە و ڕیشمان دۆڕاند ؟؟)).

بۆ ڕۆژی دوایی سوپای (تەیموری لەنگ) هێرشیانکردە سەر شارەکەمان، لە شووراکەیدا و دەرگاکانی شکاند، هەموو پیاوانی شارەکەی سەربڕی، بەو شێوەیە (تەیموری لەنگ) شاخێکی لە کەللەی سەری پیاوەکانمان بنیاتنا، تەرمەکان سیمایان زەرد و خوێناوی بوو، بەڵام زەردەخەنەیان دەکردو شانازیان بە ڕیشەکانیانەوە دەکرد، گرژ نەبوو.. هەروەك دەڵێن، خۆشییەکەی و گەشانەوەکەی لە دەست بدات، تەنیا ئەو چرکەساتە نەبێت، کە (تەیموری لەنگ) فەرمانی بە سەرتاشەکان دا ڕیشیان بتاشن.

ئا بەو شێوەیە، ئەی بەڕێزان.. ئێمە دۆڕاین، بێ تۆڵەسەندنەوە، نەنگییەکەمان مەزن بوو، بەجۆرێك هیچ خوێنێك نایکوژێنێتەوە.

# لەبیر چوونەوە

پیاوێکی نامۆ هاتە شار، لە هەموو ڕێگاکاندا هەرچۆنێکی بۆ لوا ترسی چاند، پیاوێکی پیری نێوچەوان چرچ دەنگێکی زبری ناخۆشی پێوەبوو، بە هەڕەشەوە وشەکان لەدەمی دەهاتنە دەرەوە، دەیگووت :

((بەم زووانە زەوی کاول دەبێت، تەمەنی ئەوەندەی نەماوە تەنیا ماوەیەکی کەم نەبێت، دوای ئەوە تۆفان دێت و سەراپا هەموو زیندەوەر بە هیلاك دەچێت )).

هەموو خەڵکی شار ترسیان لێنیشت، بڕوایان وابوو ئیتر مردن هاتووە، ڕەنگیان زەرد هەڵگەڕا و بێدەنگیی باڵی بەسەریاندا کێشا، بەڵام ئازایەتی و جوامێرییان بەدەستهێنا، لە مەلیك و سەربازەکانیان نەدەترسان، ڕازینەبوون باج بدەن، لە بەندینخانەو ئازارو پەتی سێدارە نەدەترسان.

مەلیك سەری سوڕما بەم گۆڕانکارییەی میللەتەکەی، بۆی شینەدەکرایەوە، داوای لە وەزیرەکەی کرد بۆ زانینی ئەم کارە، وەزیرەکەی پاش چەند ڕۆژێك گەڕایەوە و بەمەلیکی وت :

– ئەوان وا دەزانن مردن بەڕێوەیە !!.

مەلیك بەسەرسوڕمانەوە وتی :

+ مردن بەڕێوەیە !!.

وەزیرەکەش وەڵامی دایەوە وتی :

– پیاوێکی نامۆ بڕوای پێهێناون، کە مردن بەڕێوەیە !!.

مەلیك توورە بوو و قیژاندی :

+ هەر ئێستا ئەو پیاوە نامۆیەم بۆ بهێنن.

وەزیر زەردەخەنە گرتی و وتی :

– ئەو پیاوە زیندانییە لە یەکێك لە بەندینخانەکان، گەورەم !!.

پیاوە نامۆکەیان ئامادەکردو ڕیسوایان کردبوو و بە زنجیر بەستبوویانەوە، مەلیك بە چاودێریکردنەوە تێی دەڕوانی و ڕووی تێکرد و پێی وت :

+ تۆیت پڕوپاگەندە بڵاودەکەیتەوە گوایە وڵاتەکەمان لەناودەچێت !؟.

پیاوە نامۆکەش وەڵامی دایەوە و وتی :

++ ئەوەی دەیڵێم پڕوپاگەندە نییە، بەڵکو ڕاستییە، مرۆڤ تەنیا ئێسقان و گۆشتی ماوە، ئێستا کاتی ئەوە هاتووە، کە لەشی دڕندە لە ناوبچێت، هیچ شتێك لە مردن ڕزگاری ناکات.

مەلیك بە ئارامییەوە پێی وت :

+ ئەوەی دەیڵێیت بە ڕاستە !؟، هیچ شتێك لەمردن ڕزگار نابێت !!؟؟.

مەلیك ئاوڕی لە جەللادەکە دایەوە، کە لە تەنیشتیەوە ڕاوەستابوو، شمشێرێکی دەسك چەماوەی بەدەستەوە بوو، بەپەنجەی ئاماژەی بۆ پیاوە نامۆکە کرد و وتی :

+ سەری بپەڕێنە !!.

جەللادەکە یەکسەر سەری پیاوە نامۆکەی پەڕاند، کەللەسەرەکەی خلبووەوە بۆ سەر زەوی، دوای ئەوە لاشەکەی کەمێك لەخوێندا گەوزاو بێدەنگ بوو.

مەلیك هەناسەیەکی هەڵکێشا و چوو بۆ ناو باخچەکە، پاشان داوای شاژنی کرد بێت بۆلای و لە تەنیشتییەوە دابنیشێت، ژنەکەی هات و لە تەنیشتییەوە دانیشت و مەلیکیش پرسیاری لێکرد :

+ تۆ.. حەزت لە چ جۆرە گوڵێکە !؟.

شاژن وتی :

" مێخەکی سوور.

مەلیك فەرمانیدا درەختەكانی ناو باخچەكە ببڕنەوە و هەرچی جۆرە گوڵێكی تێدایە لەناوی ببەن، هەرچی باخچەكە هەیە بیكەن بە (مێخەكی سوور).

هەروەكو مەلیك وتی ئەوانیش وایانكرد، پاش چەند مانگێك (مێخەكی سوور) ڕووا، شاژن زۆر دڵی خۆش بوو، چونكە سەراپای باخچەكە سوور دەچووەوە و بریسكەی دەدایەوە بەڕووناكی ڕەنگی سوور، هەركاتێك ڕۆژ باڵی بەسەر ئەو ناوەدا بكێشایە، مەلیك دڵی خۆش دەبوو، ئاڵتوون لە گەنجینەكانیدا زیادیكرد، ئیتر دەستوپێوەندەكانی مردنیان لەبیرچووەوە.

# بەندەی خوا

پاپەتییەکان دڵخۆشبوون، هەور بەزیبوو حەزی بەیارمەتی بوو بۆ بەندەی خوای سواڵکەرەکان، بارانی پێڵاو لە هەموو پێوانەکان باری، بەڵام عەبدوڵڵای کوڕی سلێمان نووستبوو، ئەو دڵی خۆشنەبوو چونکە پێڵاوی چنگ نەکەوت و بەپێی پەتی مایەوە.

لەبەرئەوە عەبدوڵڵای کوڕی سلێمان دەیڕوانییە پێڵاوی خەڵکە هاتووچۆکەرەکەی ڕێگاکان و چاوی ڕژدی تێبڕیبوون، ڕژدیی خوا بەدووری گرتووە لێمان کە سەرچاوەی بەڵایە، هەروەك چۆن دەزانن شەڕێکی گەورەیە پیاوی ڕژد حەقی تۆڵەی هەیە، خوا بە ئاگایەو هیچ شتێکی شاراوەی لێ ون نابێت، پشتگوێی ناخات و کەمتەرخەم نییە.

عەبدوڵڵای کوڕی سلێمان بە پێپەتی لەدایك بوو، بە پێپەتی نەشونمای کرد، بە لەسەرخۆییەوە و بەپێی پەتی دەچێتە گۆڕەوە، بەڵام ئیبلیسی لەعنەت لێکراو و شەرمەزاربووی بەردەمی خوا، دوودڵیی خستە بەر گوێکانی، جوانکاریی خستە بەردەستی کە ببێتە بەندەی خوا، لەوانەی بوونەتە خاوەنی پێڵاو، عەبدوڵڵای کوڕی سلێمان هاندانەکەی ئیبلیسی ڕەتنەکردەوە بەڵکو گوێڕایەڵی بوو، دەبێت ئێوە بزانن کە ئیبلیس سیمای جوان نییە، دوو شاخ و کلکی هەیە.

عەبدوڵڵای کوڕی سلێمان ئەوەندەی پارە نەبوو بتوانێت پێڵاو بکڕێت، لەبەرئەوە دوودڵ نەبوو بەوەی دوای ئەو پیاوە بکەوێت کە جووتێ پێڵاوی جوانی قایشی بریقەداری لەپێدابوو، بەهەلی زانی، کە بەڕێگایەکی لابەلای چۆڵدا ڕۆیشت، پەلاماریدا و کەوتە لێدانی و بەو خەنجەرە دەسك چەماوەیەی لەباوکییەوە بەمیراتی بۆی مابووەوە یەك

خەنجەری لەسنگیدا، پیاوەکەش وەك بەردێکی قورس کەوت بەسەر زەویدا، عەبدوڵڵای کوڕی سلێمان لەسەر چۆك بۆی دانیشت بۆ ئەوەی پێڵاوەکانی لەپێ دابکەنێت.

لەو کاتەدا ئێشککگرەکانی پۆلیس بەو جێگایەدا ڕۆیشتن، عەبدوڵڵای کوڕی سلێمانیان گرت، چونکە نەیتوانی تاوانە ترسناکەکەی بشارێتەوە، خەنجەرەکەی ئەم خوێناوییە، پیاوە سنگ پارچە پارچەکراوەکەش لەخوێنی خۆیدا دەگەوزێت و خەریکە دواهەناسەی دەردەچێت، ئاماژەیان بۆ عەبدوڵڵای کوڕی سلێمان کرد کە ئەوە بکوژەکەیە.

ئەوەی ڕوویدا لە ڕۆژی شەممەدا بوو، عەبدوڵڵای کوڕی سلێمان ڕۆژی یەکشەممەی لەبەندینخانە بەسەربرد، بۆ ڕۆژی دوایی بردیان بۆ دادگا، دوای ئەوە لە هەمان ڕۆژدا گێڕایانەوە بۆ بەندینخانە، تاکو ڕۆژی هەینی لەوێ مایەوە، هەروەك دەزانن بە پەشیمانییەوە دەگریا، داوای لە خوا دەکرد لێی خۆشبێت و ئەم تاوانەی دوا کاری نابەجێی ئەو بێت، لەعنەتی لە ئیبلیسی مایە فیتنەکرد، ڕۆژی هەینی خەڵکی لەخەو بەئاگا هاتنەوە، خواردنی بەیانییان بە چێژەوە خوارد بەدەم باوێشك و خۆکێشانەوە و تەمەڵییەوە، بەڵام هەندێکیان مەشقی وەرزشییان کرد، وەرزش وەك دەزانن سوودمەندە بۆ جوڵاندنی هاتووچۆی خوێن.

هەرکە دەنگی بانگدەر بەرز بووەوە بۆ نوێژی نیوەڕۆ، پیاوان بەدەم دەنگەکەوە هاتن و لەماڵەکانیان دەرچوون بەرەو مزگەوتەکە، لەوێ نوێژی نیوەڕۆیان بەئەنجام گەیاند، داوایان لەخوای گەورە کرد خواستەکانیان بۆ جێبەجێ بکات، چونکە ئەوان بەندەی پاك وخواپەرستن.

هەرکە نوێژی نیوەڕۆ تەواوبوو نوێژکەرەکان مزگەوتەکەیان جێهێشت، بەسەربەرزییەوە کەوتنەڕێ بەشەقامەکاندا، سیمایان ڕەزامەندیی لێدەباری و ئارام و ڕازیبوون، پێڵاوەکانیان لەسەر پیادەڕەوەکان دەنگیان دەهات، ئەو کاتە عەبدوڵڵای کوڕی سلێمان برا بۆ گۆڕەپانە گەورەکە، گۆڕەپانەکە زەوییەکەی خۆڵ بوو، سەربازەکان بە تفەنگەکانیانەوە چواردەوریان گرتبوو، خەڵکی لە پشتی سەربازەکانەوە ڕاوەستابوون،

کەوتبوونە پاڵەپەستۆو هاوارکردن، عەبدوڵڵای کوڕی سلێمان لەناوەڕاستی گۆڕەپانەکە ڕاگیرا، لەپشتەوە دەستیان بەستبووەوە، دوای ئەوە پیاوێکی ڕیش سپی ڕیش درێژیان هێنا، لەنزیکییەوە ڕاوەستا، پەڕەیەکی زەردی دەرهێناو دەستیکرد بە خوێندنەوەی.

پاش ئەوەی کابرای ڕیش درێژ لە خوێندنەوە تەواوبوو، ژمارەیەك پیاو کە بەرگی سپییان لەبەردا بوو هاتنە ناوەڕاستی گۆڕەپانەکەوە :

((ئەمانە کێن !؟ ))

((ئەمانە خزمی پیاوە کوژراوەکەن، ڕەحمەتی خوای لێبێت)).

پیاوەکان چواردەوری عەبدوڵڵای کوڕی سلێمانیانی دەستبەسەرکراویان گرت و هاواریان دەکرد :

ئەڵڵاهو ئەکبەر.. ئەڵڵاهو ئەکبەر.

ئافرەتێك کەوتە هەلهەلە لێدانی تیژو بەرز لەو کاتەی هێرشیانکردە سەر عەبدوڵڵای کوڕی سلێمان بە خەنجەرە چەماوەکانیانەوە کەوتنە لێدانی.

عەبدوڵڵای کوڕی سلێمان بەلادا هات لەکاتی خەنجەر لێدانی بەتووڕەیی و جووڵەوە خەنجەرەکانیان ڕادەکێشایەوە تاوەکو هەموو لەشی کون کون بوو و خوێن چۆڕاوگەی بەست، ئیدی نەیتوانی خۆی ڕابگرێت و کەوتە سەر زەوی، پیاوەکان بەچواردەوریدا ڕاوەستان، هەر بەردەوام بوون لە خەنجەر لێدانی ئەو لاشەیەی پێڵاوی لە پێدا نەبوو.

دوای تۆزێك عەبدوڵڵای کوڕی سلێمان تەرمەکەی هەڵگیراو خستیانە ناو ئۆتۆمبێلی فریاکەوتنەوە، کە هەموو لەشی پارچە پارچەکرابوو و خوێنی لێدەچۆڕا.

وەك دەبینن ئیبلیس بەم جۆرە دۆڕاندی، عەبدوڵڵای کوڕی ئیبلیسیش بە پێی پەتی لە چاڵێکدا نێژرا و خۆڵیان بە سەریدا کرد.. ئەمەش وانەیەك بوو بۆ ئەو ڕێگا ونکەرانەی دەیانەوێت هەتاکو مردن بە پێی پەتی بمێننەوە.

# ناپاڵم.. ناپاڵم

(لەیلا) لە شەقامەکانی (قگین) بەترسەوە دەڕۆیشت، ئەوەی مابووەوە لە جەنگاوەرەکان چاوەڕێی پیشەکی مردنیان دەکرد لەناو ژوورەکانی خەستەخانەدا، جلەشۆراوەکان بە بالکۆنی تەلارەکانەوە وەك ئاڵایەکی سپی هەڵواسرابوون، لەژێر خۆری حوزەیراندا دەشەکانەوە، لێوەلەرەی پێکەوتبوو و پرسیارەکەی دەوتەوە :

+ کەسی لێ ڕزگار نەبووە !! ؟.

(لەیلا)ش خێرا وەڵامی دایەوە :

– مردنێکی هێواش دەمردن، ئەحمەد.. خۆزگە چاوت لێیان دەبوو، ئەوانە مرۆڤ نەبوون، پارچەگۆشتی ڕەشی سووتاو بوون، بۆنێکیان لێدەهات تەنانەت دوای مردنیش لەبیرت نەدەچووەوە.

(ئەحمەد) تۆزێك سەری دانەواند، زیندەوەرێکی نوێی لە خەڵکی زەوی هاتە بەرچاو، بەهێواشیی دەڕۆیشتن وەك هێواشیی مانگ و گوڵ.

(لەیلا) بەردەوام بوو لەقسەکانی وتی :

– دوێنێ چوومە ژووری ئافرەتێکی پیری لادێی، بەدوای کوڕە بریندارەکەیدا دەگەڕا، بۆی نەدۆزرایەوە ویستی بێتە دەرەوە، لەوکاتەدا گوێی لە دەنگێك بوو بانگی دەکرد، خاوەنی دەنگەکە پارچەیەکی ڕەشی ئاوساو بوو بەدەر لە هەموو ئاماژەیەکی مرۆڤ تەنیا چاوەکانی نەبێت، ژنەکە نەگریاو نەیقیژاند، بە دوودڵییەوە لە قەرەوێڵەکەی نزیك بووەوە و لەسەر لێوارەکەی دانیشت،

ناسییەوە بەگەرمی سڵاوی لە کوڕەکەی کرد و پرسیاری تەندروستی لێکرد..
چاوەڕێی وەڵامی نەکرد یەکسەر کەوتە قسەکردن، براکان وەك دێو وان هەمیشە لەیەکتر دەدەن و بەرد دەگرنە یەکتر و قاپ و قاچاغ و پەنجەرەی ژوورەکان دەشکێنن و کلکی پشیلەکان ڕادەکێشن، باوکی ئێستا جگەرە ناکێشێ، پێبکەنە، دەبیتە (خاڵ)، خوشکە بەشووەکەت دوو مانگی تر منداڵی دەبێت، زاواکەت حەزی لە کچە،
بەڵام خوشکەکەت کوڕی دەوێت، باوکت داوایکرد بۆ نەهێشتنی ئەم دووبەرەکییە خوشکت کوڕێك و کچێکی ببێت، کوڕەکەی ویستی پێبکەنێت، بەڵام پێستی دەم و چاوی گرژ بوو، زەرداوێك لە برینەکانی سەر دەم و چاوی هاتە دەرەوە.

قومبەلەکە بەبێ دەنگدانەوە تەقییەوە، ئەحمەد لەناو شلەمەنییە ئاگراوییەکە ونبوو، بە زمانێکی تیژەوە بە (لەیلا)ی وت :

+ بەس قسەبکە !.

(لەیلا)ش سەیرێکی کرد و بەگاڵتەکردنێکەوە وتی :

— فەرمانت بەجێیە ! ، دوێنێ ئەستێرەیەکم بینی سەندەویشی دەکڕی، دوایی سواری عارەبانەیەکی ئاڵتوونی بوو، ئەمیرێك ڕایدەکێشا، کە ناوی (شەو) بوو، قسەکانمت پێخۆشە یان بێدەنگ بم !؟.

ئەو هیچ قسەی نەکرد، بەزەردەخەنەوە دەیڕوانییە جل وبەرگەکەی کە لە بەرگی سەربازیی دەچوو، ئافرەتێکی بە لەزەت و جوانە !، بەڵام لەو کاتەدا شمشێرێکی تیژ شکستە بوو.

(لەیلا) هەناسەیەکی هەڵکێشا و وتی :

— ئەحمەد.. بەڕاستی من ماندووم !

+ وەرە با لە ماڵی خۆمان ڕاکشێین.

(لەیلا) داواکەی بەسەربادانەوە ڕەتکردەوە، ئەحمەدیش بە تووڕەییەوە وتی :

+ دڵداری ڕۆیشتن نییە بە شەقامەکاندا ، یان بینینی فیلم و قسەکردن لەسەر ئایندەو بەس !.

(لەیلا) هەر بێدەنگ بوو.. ڕۆژێك لە ڕۆژانی ئاینده قومبەلەیەك تەقییەوە، ئەحمەد لە شلەمەنییەکەیدا ڕۆچوو، سیمای چرچ بوو و کەوتە ناو ئازارە ناخۆشەکانییەوە.

(لەیلا) بە لێدوانێکی بەجێهێشتن وتی :

– عاجز بووم !.

ئەمیش بە زوویی وەڵامی دایەوە و وتی :

+ ڕۆژێك لە ڕۆژان دەچیتە ژوورێکی خەستەخانەوە، ئەو کاتەی دەتەوێت بێیتە دەرەوە بانگت دەکەم و لەلێواری قەرەوێڵەکەم دادەنیشی و باسی قەڵەم و کتێبم بۆ دەکەیت !.

(لەیلا) دەستیگرت و وتی :

– بێدەنگ بە.. ئەم قسەیە چییە !.

ئەحمەدیش بەزمانێکی نێرانەوە پێی وت :

+ دەستم بەرەڵڵاکە نەوەك یەکێك بمانبینێ و بە کەس و کارەکەت بڵێت.

دەرگای بەندینخانە شکا، دایکەکەو ئامۆژگارییەکانی مردن، باوك مردو بەرق لێبوونەوەی لەکچەکانی، لەوانەی تەنیا ڕووڕەشی و ئابڕوچوون بۆ خێزانەکانیان جێدەهێڵن.

+ تۆ ناترسیت !؟

دەستی لەدەستی نەبووەوە، خۆشی بە دەستە زبرو پەنجە درێژەکانی دەگەیشت، ئازارەکانی دەتوایەوە لەسۆزەکانی دەستی ئافرەتدا، بەخۆشییەوە بەردەوام بوون لەبێدەنگیدا، لەگەڵ ئەوەی جەنگاوەرەکان لەگیانەڵڵادا بوون لەناو ژوورەکانی خەستەخانەدا، زۆر ڕۆیشتن تاکو گەیشتنە دووڕییانی جیابوونەوە، ئەو کاتە ئەحمەد لە ڕۆیشتن وەستا، بەپەنجەکانی ئاماژەی بۆ بینایەکی زەرد دەکرد و وتی :

+ لێرە نیشتەجێم لە ژوورێکدام لەسەربانەکەی، پێشت دەکەوم.

بەجێیهێشت بەبێ ئەوەی چاوەڕێی وەڵامەکەی بکاتەوە، بەڕاکردن بەسەر پلەکانی بیناکەدا سەرکەوت، بەدەستێکی لەرزۆکەوە دەرگاکەی کردەوە، بە هەناسەبڕکێ چووە ژوورەوە لەسەر لێواری قەرەوێڵەکەی دانیشت و پاشان ڕاکشا و چاوەکانی لێکنا.

بە ڕووتی دەیبینێ ئەو کاتەی ڕۆژی حوزەیران ئاوادەبێت، شەو پاڵدەنێ بۆ نێو ڕێگاکان وەك فیشەکێکی گڕاوی، ئەو شەوەی خاوەنی مەل نییە لە ئەستێرەکان هەست دەکات و چاودێری دەکات بەلەرزۆکییەوە، کە سەرەتای مردنیەتی.

دوای تۆزێك هەستی بە جووڵەیەك کرد، بەتامەزرۆییەوە چاوەکانی کردەوە، سەیریکرد (لەیلا) یە دەرگاکە دادەخات و پێدەکەنێت، بەئارامییەوە هەناسەیەکی هەڵکێشا و پرسیاری لێکرد :

((بۆچی پێدەکەنیت !؟ ئایا ژوورەکەمت پێ جوان نییە ؟.))

((پیاوێك لە نهۆمی سێهەم وا سەرنجی ئەدام وەك ئەوەی لەژیانیدا ئافرەتی نەدیبێت !! ))

((ڕیشی هەبوو ؟؟))

((ڕیشی درێژو پشتی چەماوە بوو))

((ئەوە خاوەنی بیناکەیە))

بەردەوام بوو لە دانیشتنی لەسەر لێواری قەرەوێڵەکە، بە هەناسەسوارییەوە لێی نزیك دەبووەوە، دەمیان خستە ناودەمی یەکترەوە، وەك دوو زیندەوەری برسی حەزیان لە ئاهەنگ بێت، لەو کاتەدا زەوی بەرگی ماتەمینی سووتاند، خەڵکەکە گۆرانیان بۆ گیای سەوز دەوت، دوژمن خۆی کوشت، قومبەلەکانیان گۆڕرا بۆ گوڵی سوور، زەنگی دەرگاکە لێدرا، لێوەکان هێشتا پێکەوە نووسابوون، بەڵام زەنگی دەرگاکە بەردەوام بوو لە لێدان.

ئەحمەد دەرگاکەی کردەوە، سەیریکرد پیاوێکی پیری ڕیش درێژ لەبەردەمیدایە، بەزۆر زەردەخەنەی هێنایە سەر لێوی خۆی و بە ناڕەزاییەوە وتی :

((ئەهلەن وەسەهلەن ))

پیرەکەش کۆکەیەکی بۆ کردو بە ڕووشکاوییەوە وتی :

((گوێبگرە.. کاتێك ئەم ژوورەم پێدایت مەرجمان ئەوە بوو، کە ئافرەت نەهێنی بۆ ئێرە)).

((ئەوە دەستگیرانمە !!)).

((دەستگیرانت !!؟، پێخۆشحاڵم پێویستە هەر ئێستا لەم بینایە بچیتە دەرەوە.. بیناکەم خێزانی ڕێزداری تێدایە )).

((تۆ بۆت نییە دەست بخەیتە کاروباری خەڵکەوە)).

((بیناکە، بینای منە.. ڕێگا بە کەس نادەم بیکاتە شوێنی سۆزانییەکان )).

(( جوێن مەدە، ئەگینا پاشان پەشیمان دەبیتەوە !!))

((چی دەڵێیت ؟ هەڕەشەم لێدەکەیت !؟ وادیارە قسەکردن لەگەڵ تۆدا سوودی نییە.. دوا قسەم بۆ تۆ ئەگەر هەر ئێستا ئەو ئافرەتە لەم بینایە نەچێتە دەرەوە، ئەوا داوای پۆلیس دەکەم ))

((چی دەکەی، بیکە !!))

ئەحمەد بەتوندی دەرگاکەی پێوەدایەوە، گەڕایەوە ژوورەوە بینی وا (لەیلا) بە سیمایەکی زەرد هەڵگەڕاوەوە لەسەر لێواری جێگاکەی دانیشتووە، بەچرپە وتی

((بڕۆم... !!؟؟))

ئەحمەد بە ڕەتکردنەوەوە سەری بۆ ڕاوەشاند، لەسەرخۆ سەیری دەکرد و دەیبینی، کە ئافرەت منداڵی دەبێ وەك پارچەیەك گۆشتی بۆنکراوی سووتاو دەبێ.

گوللە تۆپ لەسەر گوللە تۆپ دەکەوتە خوارەوە، چایخانەکان و منارەکان و قوتابخانەکان و خەستەخانەکان و شوێنی نووستنەکانی ڕووخاند، شەو و بارانی پێکەوە سووتاند، بەڵام ئەحمەد فەرمانیدا بە هاویشتنی گوللەتۆپی زیاتر.

## برسێتی

ئەحمەد مەلیك نەبوو، لەم چایخانە دەچوو بۆ ئەو چایخانە بێ ئەوەی یەکێك بناسێ، نەیتوانی بچێت بۆلای هاورێ وێنەکێشەکەی کە زۆر هەژار بوو.

وێنەکێشەکە پێشوازی لە ئەحمەد کرد، پیاوێکی رەوشت بەرز و بەخشندە بوو، لەسەر پەرەیەك مریشکێکی قەڵەوی برژاوی وێنەکردو بە ئەحمەدی وت :

((ئەمە تەنیا خواردن نییە کە شکی دەبەم))

ئەحمەد بە دڵخۆشییەوە پێکەنی، خواردنەکەی بە تامەزرۆییەوە خوارد، بەڵام هیوای ئەوە بوو ئەگەر لەناو زەیت دا و بەسیری کوتراوەوە بوایە باشتر بوو، پاشان دەمی بە پشتی دەستی سری و وتی :

((ئەلحەمدولیلا))

سوپاسی گەرمی هاورێ وێنەکێشەکەی کرد و بۆ ماوەیەك بێدەنگ بوو، دوایی بەزەردەخەنەیەکی فێڵاوییەوە رووی‌کردە هاورێکەی، وتی :

((تۆ.. حەزت لە سەرمەستی نییە !؟؟))

((نەء !!))

((بۆچی نەء !!))

((چونکە من دژی مەیم ))

((تەنیا قومێکی بچووك ))

((پاڕانەوە سوودی نییە، پێویستە هەموو مرۆڤێك دوژمنێكی هەبێت، من (مەی) دوژمنمە)).
((مەی زیانی نییە !!))
((پێویست بە پاڕانەوە ناكات، من بیروڕای خۆم ناگۆڕم)).
ئەحمەد ناڕازیبوو، لەهاوڕێ ڕژدەكەی، لەجێگای وێنەكێشانەكەی بە ناڕەزایی و دڵتەنگییەوە هاتەدەرەوە و كەوتە ڕۆیشتن بە شەقامەكاندا لەژێر هەتاوی مانگی ئابدا، پیاوێكی پیری تەمەن هەزارەها ساڵ بەدەنگێكی بەرز وتی :
((ئای دایكە !!))
ئەوەندە نەڕۆیشت ئیتر لارەلاری پێكەوت و كەوتە سەرزەوی، چاوەكانی بە قورسی لێكنا، ڕۆژ لەبەرچاوی نەماو تاریكی داهات، لەوكاتەدا هەندێك دەستی نەناسراو یارمەتیانداو سواری عەرەبانەیەكیان كرد، گوێی لە خەڵكی بوو دەیانچرپاند بە گوێی یەكتردا و دەیانگوت :
((گەورەم مەلیك، ئەحمەد نەخۆشە !))
عەرەبانەكە ڕۆیشت، ئەحمەد گوێی لەدەنگی پێچكەكانی و سمی ئەسپەكان نەبوو، دوای ماوەیەك عەرەبانەكە وەستا، ئەحمەد لەپڕێكدا هەستی بە هێزێكی كتوپڕ كرد، هەستاو لە عەرەبانەكە دابەزی، بینی خەڵكانێكی زۆر سەری بۆ دادەنەوێنن و خۆیان دەچەمێننەوە، چووە نێو كۆشكێكی گەورەوە، كەنیزەك و كارەكەر چواردەوریان گرتبوو ، ڕووی تێكردن و وتی :
((من برسیمە)).
پاشان لەسەر كورسییەكی نەرم دانیشت، كارەكەرەكان بەپەلەهاتن بەلایەوە و بەلەمێكی گەورەی خواردنیان لەبەردەمی دانا و پێیان وت :
((ئەمە بە نرخترین خواردنی چێشتخانەی مەلیكە !!)).
ئەحمەد سەرقاپی خواردنەكەی هەڵدایەوە كوتوپڕ مندالێكی زیندووی بینی، هەڵوێستەیەكی كرد و لەشی موچڕكەی پێداهات، ویستی هەڵبێت،

بەڵام ناچاربوو بمێنێتەوە و دەستی بە ساردییەکەوە بۆ چەقۆ و چەتاڵ درێژکرد، بە چەقۆکە بەشێکی دەستەکەی لێکردەوە، ددانەکانی بە لەزەتەوە لە پارچە تازە خوێناوییەکە توندکرد، لەکاتێکدا منداڵەکە هاتوهاواری بوو، ئافرەتێکی جل وبەرگ ڕەش هات، بە تووڕەییەوە هاواریکرد :

((منداڵەکەمت خوارد !!))

ئەحمەدیش بەساردییەکەوە وتی :

((منداڵێکی ترت دەبێت !!))

((چۆن من بێ پیاو منداڵم دەبێت !؟)).

((هەر پیاو زۆرە !!)).

ئافرەتەکە کێشای بە ئەژنۆیدا و هاواریکرد وتی :

((پیاوێکم بدەرێ !!)).

ئەحمەد کەوتە قسەکردن، بەدەستەکانی ئاماژەی بۆ ئەو پیاوانە کرد، کە لە دەوروپشتی وەستابوون و وتی :

((هەڵبژێرە کام پیاوەیانت دەوێ ؟))

ئافرەتەکە سەیری پیاوەکانی دەکرد و دواتر وتی :

((ئەو پیاوەی کە من دەمەوێت هەڵمبژاردووە))

((کامەیانە ! ؟))

(( تۆیت !!))

ئەحمەد دەسەڵاتی هەبوو فەرمان بدات سەری ببڕن، بەڵام لەوکاتەدا زۆر دڵخۆشبوو، هەستاو دەستی ئافرەتەکەی گرت و بردی بۆ ژوورێك، هەرکە لە دوای خۆیەوە دەرگاکەی داخست ئافرەتەکە بەپەلەو بەپێکەنینێکی فێڵاوییەوە بە دەستەکانی باوەشی پێداکردو بەتوندی دەستەکانی لە ملییەوە ئاڵاند، ئەحمەد هاواری پێکەوت و داوای یارمەتیکرد، دایکی بە هانایەوە هات، بەسۆزەوە باوەشی پێداکردو وتی :

((دەی دەرمانەکە بخۆوە !!))

بەیادی جارانەوە سەری سۆزی خستە سەرسنگی دایکی، تۆزە تۆزە ئازارەکەی کەم بووەوە، چاویکردەوە، خۆی دەبینیٚ لە دوکانێکی سەرتاشخانە لەسەر کورسییەکە دانیشتووە، خەڵکانێکی زۆر چواردەوریان گرتووە، ڕووی بە ئاو تەڕکرابوو، ئەو کاتە پێی زانی کە چی ڕوویداوە !، سەرتاشەکە پیاوێکی سەرسپی بوو، بەخۆشەویستییەوە زەردەخەنەی بۆ ئەحمەد کردو پێی وت :

((لەکاتێکدا بەشەقامەکاندا دەڕۆیشتی لەهۆش خۆت چوویت !!)).

ئەحمەد هەستایە سەرپیٚ، سەرتاشەکەش پرسیاری لێکرد وتی :

((دەتوانی بڕۆیت ؟)).

ئەحمەد سەری ڕازیبوونی بۆ دانەواند، دوایی دوکانی سەرتاشەکەی جێهێشت، بەتەنیا بەشەقامەکاندا کەوتە ڕۆیشتن، پاش تۆزێك ڕاوەستا بەهۆی ڕاگرتنی لەلایەن پیاوێکی پیرەوە، کە پرسیاری لێکرد :

((ماڵی دکتۆر بەشیر بارودی دەزانی !؟)).

ئەحمەد وەڵامی دایەوە :

((نەخێر !!)).

پیاوە پیرەکە بە شێوەیەکی سەرزەنشتی پێی وت :

((چۆن کلینیکەکەی نازانی ؟ ئەو دکتۆرێکی بەناوبانگە !! ؟)).

ئەحمەد زەردەخەنەیەك گرتی، بە هەنگاوی هێواش کەوتەوە ڕۆیشتن بەنێو شەقامە لاوەکییەکاندا، کە بینایەکی زۆری لەملاو ئەولاوە هەبوو، ئەحمەد چووە دوکانی بەقاڵێکەوە و لەکابرای بەقاڵی پرسی :

((ماڵی دکتۆر ئەحمەد نیزامی دەزانی !؟)).

کابراش وەڵامی دایەوە :

((لەمەوپێش ئەم ناوەم نەبیستووە !!)).

ئەحمەد زیاتر ڕوونیکردەوە وتی :

((ئەو پزیشکی منداڵانە، پرسیارم لە کلینیکەکە کرد، لەوێ نەبوو، پەرستیارەکەی کە لە ماڵەکەیەتی دەکەوێتە ئەم شەقامەوە، وتی :

((تکایە کوڕە بچکۆلانەکەم نەخۆشەو حاڵەتی باش نییە)).

((دکتۆرێك بەو ناوەوە ناناسم)).

ئەحمەد بە داوای لێبووردنەوە سەری ڕاوەشاند، بەسیمایەکی تەنگەوە کەوتەوە ڕۆیشتن، تاوەکو ئافرەتێکی کارگوزاری گەنجی بینی لە یەکێك لەبیناکان دەهاتە خوارەوە، ڕایگرت و وتی :

((ماڵی دکتۆر ئەحمەد نیزامی دەزانی !؟)).

ئافرەتە کارگوزارەکە وتی :

((ئەحمەد نیزامی.. ئەحمەد نیزامی؟؟))

((بەڵی ناوی ئەحمەد نڤامییە.. دکتۆرێکی شارەزایە، ژنەکەم نەخۆشەو زۆر پێویستی پێی هەیە)).

کارگوزارەکە بەدەستی ئاماژەی بۆ بینایەکی ڕەنگ زەرد کرد و وتی :

((ئەو لەوێ نیشتەجێیە، بەڵام نازانم لە چ نهۆمێکە ! )).

ئەحمەد زۆر سوپاسی کرد و دەستبەجێ بەئاراستەی بینا زەردەکە ڕۆیشت، چووە ژوورەوە و سەرکەوتە نهۆمی یەکەم و لەدەرگای دا، بەزوویی دەرگاکەی بۆ کرایەوە، پیرێژنێك سەری هێنایە دەرەوە و ئەحمەد پێی وت :

((ئێرە ماڵی دکتۆر ئەحمەد نیزامییە ؟)).

((نەخێر.. ئەو لە نهۆمی دووهەم نیشتەجێیە)).

ئەحمەد بە پلیکانەکاندا سەرکەوت بۆ نهۆمی دووهەم، لەزەنگی دەرگاکەی دا و بۆ ماوەیەك چاوەڕێی کرد، پیاوێکی قژ بژ دەرگاکەی کردەوە، ئەحمەد ڕووی تێکردو پرسیاری لێکرد وتی :

((ئێرە ماڵی.... ؟ !))

پیاوەکە قسەکەی پێبڕی و وتی :

((ئەو لە نهۆمی سێهەم نیشتەجێیە )).

ئەحمەد بەسەرسوڕمانەوە وتی :

((کێ لە نهۆمی سێهەم نیشتەجێیە !؟)).

((تۆ ماڵی دکتۆر ؟.. ئەو لە نهۆمی سێهەم نیشتەجێیە !)).

ئەحمەد بێئەوەی سەرسوڕمانەکەی لێبێتەوە سەرکەوت بۆ نهۆمی سێهەم، لەوێ پەنجەی بەزەنگی دەرگاکە دانا، خۆی گوێی لەدەنگی زەنگەکە نەبوو، لەبەر خۆیەوە وتی:

((لەوانەیە زەنگەکە لە کارکەوتبێت)).

بەدەستەکانی لە تەختەی دەرگاکەیدا، گوێبیستی دەنگی ئافرەتێك بوو وتی :

((ئەی دێوەزمە بچۆ دەرگاکە بکەوە !!)).

دوای تۆزێك کیژێکی سوورباوی بچووك دەرگاکەی کردەوە، بەسەرسوڕمانەوە سەیری ئەحمەدی کرد، ئەحمەدیش پێی وت :

((ئەحمەد لە کوێیە !؟)).

((ئەحمەد !! ؟؟ دکتۆر ئەحمەد ؟)).

((بەڵێ.. دکتۆر ئەحمەد نیزامی )).

((دکتۆر ئەحمەد نیزامی لە نهۆمی یەکەم نیشتەجێیە !)).

((سوپاس کچۆڵە، داوای لێبووردن دەکەم جاڕسمکردیت، مێردەکەت لە ماڵەوەیە !؟)).

((مێردەکەم ؟؟)).

((بۆچی تۆ شووت نەکردووە !؟)).

کچەکە بەترسەوە سەیری کرد و دەرگاکەی داخستەوە، ئەحمەدیش بەپەلە بە پلیکانەکاندا چووەوە خوارەوە، بەشەقامەکاندا کەوتە ڕاکردن و بەبیریدا هات کە پیاوانی پۆلیس دەیگرن، بە پێڵاوە قورسەکانیان دەکەونە لێدانی.

کاتێك گەیشتەوە ژوورەکەی هەناسەیەکی ئارامیی هەڵکێشا و لەبەردەمی ئاوێنەکەدا ڕاوەستا، مێردمنداڵێکی سیما زەردی بینی و پێی وت :

((ئەوە تۆی دکتۆر ئەحمەد !؟؟ زۆر بەشوێنتدا گەڕام.. نەمدۆزیتەوە، من نەخۆشم، پشکنینم بۆ بکە)).

دکتۆر وتی :

((تۆ نەخۆشی ؟ باش.. من بەم شێوەیە ڕێنماییت دەکەم... گۆشت و سێو بخۆ..)).

((خواردنی سێو بۆ من باشە ؟؟)).

((پێویستە ڕەنگی سێوەکەی، کە دەیخۆیت زەردباوێکی ڕەنگ سوور بێت)).

((ئەی هەڵوژە ؟؟)).

((تەنیا یەك دانە بەسە)).

((ئەی تریێ ؟؟)).

((زیانی نییە.. چەندی دەخۆی بخۆ !))

سەری دانەواند و بەژوورەکەیدا گەڕا بۆ ئەوەی شتێك بدۆزێتەوە بیخوات، نیوەنانێکی وشکی ڕەقی لەژێر کتێبەکانی سەر مێزەکە دۆزییەوە، بە ئاو تەڕیکردو لەسەرخۆ دەستیکرد بەخواردنی و لەسەر جێگەکەی ڕاکشا، ئەوەندەی پێنەچوو خەوی لێکەوت، لە خەویدا ئافرەتێکی جوانی بینی بە گەرمییەوە باوەشی پێداکرد، گۆشتەکەی نانێکی سپی گەرم بوو.

# پۆلیس و ئەسپ

باوکی مستەفا عەرەبانەکەی لە لێواری پیادەڕەوەکە ڕاگرت، بەدەستەگەورە قڵیشاوەکەی بەسەری ئەسپەکەیدا دا، دوایی چووە دوکانە نزیکەکەوە، دەستیکرد بە هەڵگرتنی ئەو گونیانەی پڕبوون لە دارو چیلکە، گواستنیەوە بۆ سەر عارەبانەکەی.

ئەسپەکە تووڕە بوو بەبێ هیچ هۆکارێك، کاتێك توێکڵە شووتییەکی دۆزییەوە هێور بووەوە کەوتە پارچە پارچەکردنی بە چەقۆ، لەپڕێکدا هەستیکرد مێردمنداڵێکی بچووك لە نزیکییەوە ڕاوەستاوە، بە زەردەخەنەو تێیدەڕوانی، ئەسپەکە وتی :

((من نایناسم، ئەگەر بێت و لێم نزیك بکەوێتەوە یەك لەقەی لێدەدەم، لەقەیەکی بەهێز بەشێوەیەك سەری بشکێنم)).

پاش تۆزێك ئەسپەکە لە خواردنی توێکڵە شووتییەکە بووەوە، پێی ناخۆشبوو کە لێبووەوە، بە تووڕەییەوە سەیری منداڵەکەی دەکرد و وتی :

((لەقەی لێدەدەم !!)).

لەوکاتەدا باوکی مستەفا سەرقاڵی گواستنەوەی گونییە چیلکەکان بوو بۆ سەر عارەبانەکە، ئەسپەکە هەستی بە ماندوویێتی کرد و بە بێزارییەوە وتی :

((دادوەری نییە !!)).

ئەسپەکە لە شار لەدایك بوو بوو، هەموو ژیانی لەو شەقامانە بەسەربردووە، کە قیرتاوکراون، هیچ کاتێك لەشار نەچووەتە دەرەوە،

دەیزانی باب و باپیرە کۆنەکانیبەرەڵڵای مێرگەپان و بەرینەکان بوون و یارییان تێدا دەکرد،  ئەو کاتە هیچ بیناو دیواری بەردی لێنەبوو، بەڵام هەموویان مردن.

کوڕەکە چەمایەوە و پارچە شووتییەکی هەڵگرت کە لە نزیکی ئەسپەکەوە کەوتبوو، بە هێواشی لە ئەسپەکە نزیك کەوتەوە، ئەسپەکەش ویستی لێی دووربکەوێتەوە، بەڵام بەهاندانەوە چاوەڕێی کرد، منداڵەکە توێکڵە شووتییەکەی لەدەمی ئەسپەکە نزیك کردەوە،

بۆ ماوەیەك ئەسپەکە دوودڵ بوو پاشان لێی وەرگرت ودەستیکرد بە خواردنی، دوای ئەوە ڕێگای بە مێردمنداڵەکە دا بە دەستە بچکۆلانەکەی بە ملیدا بکێشێ، باوکی مستەفا گونییە دارو چیلکەکانی گواستەوە، کاتێك هەستیکرد مێردمنداڵەکە لەنزیکی ئەسپەکەوەیە، هاواری لێکرد و وتی :

((ئەی مەیموون لەو ئەسپە دوور بکەوەوە !!)).

دوای ئەوە قامچییەکەی ڕاوەشاندو هاواری لێکرد و فەرمانی بە ئەسپەکەیدا بۆ ڕۆیشتن، ئیتر ئەسپەکەی کەوتە ڕۆیشتن و ئەو عارەبانە قورسەی بەهێواشی ڕادەکێشا، عارەبانەکە بەنێو شەقامەکاندا دەڕۆیشت، دواتر گەیشتە شەقامێکی پان، کە بینا بەردینەکانی لەملاو ئەولا بوو، ئەوەندەی پێنەچوو کاتێك چووە ناو شەقامە سەرەکییەکەوە پیاوێکی پۆلیس ڕێگای پێگرت، باوکی مستەفا هاواری لەئەسپەکەی کردو بەدەنگێکی تیژەوە وتی :

((هۆش ش ش )).

پۆلیسەکە بە باوکی مستەفای وت :

((تۆ نازانی هاتووچۆکردنی عارەبانە لەم شەقامەدا قەدەغەیە !؟؟)).

باوکی مستەفا وتی :

((بەڵێ دەزانم  !!)).

((ئەی کەواتە بۆچی لێرەوە هاتوویت !؟)).

((ئەسپەکەم.. تۆ بڕوانە، ئەسپەکەم زۆر ماندووە، ئەگەر بەم شەقامەدا بڕۆم، ئەوا ڕێگاکەی بۆ کورت دەکەمەوە و کەمتر ماندوودەبێت !)).

ئەسپەکە سۆزێکی زۆر دایگرت، پۆلیسەکە وتی :

((هاتووچۆی عارەبانە لەم شەقامە قەدەغەیە، ئێرە تەنیا بۆ ڕۆیشتنی ماشێن و پیادەڕەوە !)).

باوکی مستەفا وتی :

((بەڵێ دەزانم)).

بەزمانی لێوەکانی خۆی تەڕکرد و ڕوویکردە پۆلیسەکە وتی :

((ئەسپەکەم ماندووە.. ئەگەر لەناوبچێت ئیتر من ڕزقم دەبڕێت، خۆم و منداڵەکانم لەبرسانا دەمرین.. چوار منداڵم هەیە !!)).

((بگەڕێوە.. قەیناکە بۆ سەرپێچییەکەت بەرامبەر یاساو ڕێسا سزات نادەم !!)).

((چوار منداڵم هەیە ئەوەندە برسین لەبرسا بەرد دەخۆن !!)).

باوکی مستەفا پێکەنینێکی بچووکی وشکی بۆ کرد وەك چەقۆیەکی دڕندەی بچووك، پاشان وتی :

((بە ڕاستی پێتدەڵێم.. من لە منداڵەکان ناترسم، بەڵکو لە دایکیان دەترسم !!)).

پۆلیسەکە پرسیاری لێکرد و وتی :

((بۆچی لە دایکیان دەترسیت !؟)).

درەختەکان لەملاو ئەولای شەقامەکە سەوزبوون، بەرەو ئاسمانی شین هەڵکشابوون، باوکی مستەفا وەڵامی دایەوە و وتی :

((لەوە دەترسم ئەگەر منداڵەکان زۆر برسییان بێت دایکیان دەخۆن.. ئەمەش کارەساتە!!)).

ماشێنێك بە تیژی تێپەڕی، پۆلیسەکە فیکەیەکی بۆ لێدا، ماشێنەکە نەوەستا، پێش ئەوەی لەبەرچاو ون بێت ژمارەکەی لەسەر بەرگی دەفتەرەکەی تۆمار کرد، بەتووڕەیی و نێوچەوانێکی گرژەوە ئاوڕی لە باوکی مستەفا دایەوە و پێی وت :

((دەی بگەڕێوە !! )).

((تکایە ڕێگام بدە تەنیا ئەمجارە بڕۆم.)).

پۆلیسەکە بەتووڕەییەوە وتی :

((بگەڕێوە.. یاسا یاسایە، پێویست بە پاڕانەوە ناکات !!)).

((ئەسپەکەم ماندووە.. تکایە)).

((دەڵێم بگەڕێوە !)).

((خوا بۆ دایکت بهێڵێت !!)).

((خوا نەمهێڵێت.. من یاسام دانەناوە، من فەرمان جێبەجێ دەکەم تۆش پێویستە بەو فەرمانە ڕازی بیت))

باوکی مستەفا هیچی نەوت تەنیا یاسای هێنایەوە بەرچاوی خۆی کە وەك زیندەوەرێکی گەورە هەزارەها دەستی هەیە، یاسا فەرمان دەدات بەسەر پۆلیسدا، پۆلیسیش جێبەجێی دەکات، پۆلیسیش فەرمان دەدات بەسەر باوکی مستەفادا باوکی مستەفاش پێویستە جێبەجێی بکات، باوکی مستەفا بۆ ماوەیەك بە دوودڵییەوە وەستا، پۆلیسەکەش قیژاندی بەسەریدا وتی :

((بگەڕێوە.. ئەگەر ئێستا نەگەڕێیتەوە، ئەوا دوایی پەشیمان دەبیتەوە)).

باوکی مستەفا بەرەو عارەبانەکەی ڕۆیشت، تووڕەیی ئەسپەکە گەیشتە ئەوپەڕی، هەموو هێزی خۆی کۆکردەوە و بە تووندی بەرەو پێشەوە ڕۆیشت، پۆلیسەکە بینی عارەبانەکە بەرەو ڕووی ئەو دەچێت، هەوڵیدا بەپەلە بچێتە سەر پیادەڕەوەکە بەڵام نەیتوانی، ئەسپەکە خۆی پێدا کێشا، پۆلیسەکە لەسەر گازەرای پشت لەسەر زەوی کەوت، سمی ئەسپەکە لەسنگی پۆلیسەکە گیربوو و پاشان عارەبانەکەش بەسەریدا ڕۆیشت و هەموو گیانی پۆلیسەکە خەڵتانی خوێن بوو.

ئەسپەکە زۆری بەلاوە سەیر بوو، خاوەنەکەی بەمە خۆشحاڵ نەبوو، بەڵکو ترس و لەرز دایگرت، بەغارکردن و زۆر بە پەلە هەڵات، پاش تۆزێك خەڵکیی بەڕاکردن هاتن و چواردەوری عارەبانەکەیان گرت، لەنێو چەوانیاندا ترس بەدیدەکرا، کە پڕبوو لە حەزێکی شاراوە وەك ئەوەی پۆلیسە تێکشکاوەکە تەنیا لەشی ئافرەتێکی جوانە.

خەڵکی بڵاوەیان لێنەکرد تاوەکو پیاوانی پۆلیس هاتن و باوکی مستەفایان گرت، بردیانە بەردەمی دادوەر، دادوەر ڕاست بوو، لە بەیانییەکی زوودا ئەسپەکەیان برد بۆ گۆڕەپانی سەرەکی، ئەسپەکە وایدەزانی دەیبەن بۆ لەوەڕگا، بەخۆشییەوە لە گۆڕەپانەکە ڕاوەستا،

چونکە پێش ئەوە بە شەقامە پانەکەدا بردیان، کە پێشتر لێی قەدەغەکرابوو، بەڵام ئەو خۆشییەی درێژەی نەکێشا، چونکە پاش تۆزێکی تر بە خنکاویی بە پەتەکەوە شۆڕبووەوە.

# بووکی ڕۆژهەڵاتیی

سەلاح گەڕایەوە بۆ ماڵەوە، بە تووڕەییەوە کتێب و دەفتەرەکانی فڕێدایە سەر زەوی، دایکی پرسیاری لێکرد و پێی وت :

((چیتە کوڕم !؟)).

سەلاح خێرا وەلامی دایەوە و وتی :

((لە قوتابخانە بێزارم !!)).

دایکی بە دەنگێکی پڕ لەسۆزەوە لێی پرسی :

((بۆچی لە قوتابخانە بێزاری کوڕم ؟؟)).

سەلاح بۆ ماوەیەك بێدەنگ بوو و پاشان وتی :

((دەمەوێت ژن بێنم !!)).

دایکی ئەوەندەی نەمابوو لە خۆشیدا هەڵهەلەیەکی بەرزو درێژ لێبدات، ئەگەر نیگایەکی تیژی لە چاوی باوکییەوە نەبینیایە، تێکچوو، بەترسەوە بەباوکی وت :

((تۆ.. هیچ ڕێگرییەکت هەیە ! ؟؟)).

باوکەکە گرنگی نەدا بە پرسیارەکە، بەڵکو ئاوڕێکی لە سەلاح دایەوە و بەدەنگێکی ڕەق وتی :

((تۆ کوڕێکی سەرپێچی کەری، من قایل نیم بۆ ژنهێنانت)).

سەلاح بە دەم پاڕانەوەوە وتی :

((ئیتر لەم چرکەساتەوە دەبمە کوڕێکی چاك و گوێڕایەڵ، نوێژ دەکەم و بەردەوام دەبم لەنوێژکردن..)).

((ڕۆژی پێنج جار نوێژ دەکەیت ؟)).

((ڕۆژی پێنج نوێژ دەکەم !!)).
((مانگی ڕەمەزان بەڕۆژوو دەبیت ؟)).
((بەدرێژی مانگی ڕەمەزان بەڕۆژوو دەبم)).
((ئیتر شەوانە لە دەرەوەی ماڵەوە نامێنیتەوە ؟)).
((نەخێر نامێنمەوەو هەموو شەوێکیش زوو دەنووم)).
((ناخۆیتەوە !؟)).
((نەخێر ناخۆمەوە، بەپێ دەچم بۆ مەککە)).
بەم وەڵامانە سیمای باوکی خۆشی تێکەوت و وتی :
((باشە.. دە وەرە دەستم ماچ بکە !)).
سەڵاح لەباوکی نزیك کەوتەوە، سەری دانەواندو بە کڕنووشەوە دەستی باوکی ماچکرد، باوکی پێی وت :
((دەی سێ جار ماچی بکە !!)).
سەڵاح ڕازیبوو، سێ جار دەستی باوکی ماچ کرد، ئیتر باوکی بە پێکەنین و دڵخۆشییەوە وتی :
((ئێستا پێم بڵێ.. دەتەوێ کێ بهێنیت !؟)).
((ئەو کچەم دەوێت کە ڕەزامەندی باوکم و دایکمی لە سەر بێت)).
باوکی زیاتر دڵخۆشبوو، وتی :
((زۆر چاکە.. کوڕی چاك ئا بەم شێوەیە قسەدەکات)).
دایکی قسەی لەگەڵ سەڵاح کردو وتی :
((تەنیا ئاواتم ئەوە بوو، کە پێش مردنم ماڵ و مندالت ببینم !)).
باوکەکە بە دایکی سەڵاحی وت :
((دەی ژنەکە.. یارمەتیم بدە چ کچێکی بۆ هەڵبژێرین !؟)).
دایکی تۆزێك بیری کردەوە و وتی :
((هەیفای دراوسێمان کچێکی جوانە !!)).

باوكی بە دڵخۆشییەوە وتی :
((دەیناسم، دەیناسم.. بەڕاستی چاكت هەڵبژاردووە !!)).
دایكی ڕوویكردە سەلاح و وتی :
((ئەی تۆ.. دەیناسی ؟)).
سەلاح بە شێوەی پرسیارەوە وەڵامی دایەوە وتی :
((چۆن دەیناسم !؟)).
دایكی هەستایە سەرپێ و باوكی ڕووی تێكردو وتی :
((بۆكوێ ؟؟)).
((دەچم هەیفا دەهێنم !!)).
((چۆن !؟)).
((درۆیەكی لەگەڵ دەكەم و پێی دەڵێم یارمەتیم بدات لە چێشت لێناندا)).
دایكەكە چووە دەرەوە، لەوكاتەدا باوكەكە قاقایەكی لێدا و بەسەلاحی وت :
((ئەی مەلعون.. دەتەوێ ژن بێنیت !!؟؟ كاتێكی باشت هەڵبژاردووە، وا بەرەو زستان دەچین !!)).
باوكەكە كۆكەیەكی بۆكرد، بە پەرۆشەوە لەپی دەستەكانی لەیەكتر خشاند، وتی :
((چەند جوانە دوو پارچە گۆشتی گەرم لەگەڵ یەكتردا جووت بن !!)).
سەلاح بە شەرمەوە وتی :
((من حەزم لە نووستن نییە لەگەڵ ئافرەتدا !!)).
باوكەكە بەسەرسوڕمانەوە وتی :
((ئەی كەواتە بۆچی دەتەوێت ژن بهێنیت ؟)).
سەلاح بە نهێنییەوە زەردەخەنەیەكی بۆ كرد و هیچ وشەیەكی نەوت، بێدەنگیی باڵی كێشا بەسەر ژوورەكەدا، تاوەكو دایكی لەگەڵ (هەیفا) گەڕایەوە، (هەیفا) تەمەنی شانزەساڵ بوو، سپی پێست بوو، چاوەكانی ڕەش، قژی ڕەش، باڵایەكی ڕێك و لەشێكی پتەو، هاتە ژوورەوەو زۆر بەشەرمەوە لەسەر یەكێك لە كورسییەكان دانیشت.

دایکەکە بە دزییەوە ئاماژەی بۆ باوکەکە کرد، ژوورەکەیان بۆ بەجێبهێڵێت، باوکەکەش بەزەردەخەنەیەکەوە چووە دەرەوە، دایکەکەش پاش تۆزێك دوای کەوت، باوکەکە بەڕێوە بوو بۆ دەرەوە بەدایکەکەی وت :

((تۆزێکی تر دەگەڕێمەوە !)).

سەلاح بۆ ماوەیەك سەیری (هەیفا)ی کرد و لەپڕێکدا پێی وت :

((تۆ بە توانای لە کردنەوەی کارە ژمێریارییەکاندا !؟؟)).

سەری ڕاوەشاند بەنیشانەی (بەڵێ)، سەلاح زەردەخەنەیەك گرتی و وتی :

((دایکم پێی وتوویت کە من چیم دەوێت !؟؟)).

((دایکت هیچی پێنەوتووم !!)).

((ئەی پێی نەوتیت دەمەوێت ژن بهێنم !؟)).

((نەء)).

((ئەی ئاگاداری نەکردیت کە دەمەوێ کێ بهێنم ؟؟)).

((نە ء)).

((دەمەوێت تۆ بهێنم.. !! هیچ ڕێگرییەکت هەیە ؟؟)).

(هەیفا) شەرمێکی نیشاندا، بەدەنگێکی هێواشی شەرمنەوە وتی :

((ئەوە بەدەست من نییە.. بەدەست کەسوکارمە !!)).

سەلاح وتی :

((تۆ کچێکی عاقڵی، یارمەتیم دەدەیت بۆ چارەسەرکردنی کاری ژمێریاری ؟؟)).

((بێ شك یارمەتیت دەدەم !!)).

سەلاح دڵخۆشبوو، بەدەنگێکی درێژو بەرز هاواری کرد وتی :

((دایکە.. دایکە !!)).

دایکی بەپەلە هاتەژوورەوە و وتی :

((ها ڕۆڵە.. چیت دەوێ ؟)).

((هەیفام بەدڵە.. هەرئەمشەو دەمەوێت بیهێنم !!)).

((تۆ جارێ کوڕم.. چەند ڕۆژێك ڕاوەستە !!)).

((نا چاوەڕێ ناکەم !!)).

((دە کەواتە چاوەڕێ بکە تاکو باوکی (هەیفا) ئێوارە لە کاردێتەوە)).

سەلاح چاودێری (هەیفا)ی کرد و هەستیکرد، کە ئەویش زۆر حەزدەکات، (هەیفا) هەستاو ژوورەکەی بەجێهێشت بۆ ئەوەی بگەڕێتەوە بۆ ماڵی خۆیان.

دایکەکەی خۆی دەڕازاندەوە بۆ ئامادەبوون بۆ سەردانی کەسوکاری (هەیفا)، لەکاتێکدا باوکەکەی لەبەر دەمی ئاوێنەکەدا وەستابوو، دەستیکرد بە قسەکردن، لە خەیاڵی خۆیدا قسە لەگەڵ باوکی (هەیفا) دەکات، سەلاحیش لەدانیشتن بێزار بوو، لە هۆڵەکەدا کەوتە هاتووچۆ کردن، بەتووڕەییەوە سەیری ڕۆژی دەکرد و لەبەر خۆیەوە دەیوت :

((دەی بە زوویی ئاوابە !!)).

((بۆچی ؟)).

((کە شەو داهات من ژن دەهێنم !!)).

((وا بەزوویی ئاوا نابم )).

((بەردت تێدەگرم)).

((ئادەی... بەردەکانت ناگەنە لای من)).

پاش ماوەیەك ڕۆژ وردە وردە ڕووناکییەکەی زەرد دەبوو، ئەویش بە ئەنقەست هێواش دەڕۆیشت، لەکاتێکدا سەلاح لەناو هۆڵەکەدا بەهەنگاوی کورت و تیژڕەو دەهات و دەچوو.

هەرکە ڕۆژ ئاوا بوو، باوك و دایکی سەلاح بەرەو ماڵی (هەیفا) کەوتنەڕێ، پێش ئەوەی لەدەرگاکەیان بدەن دەرگاکەیان لێکردنەوە، پێشوازییان لێکردن، دایکی سەلاح چووە ژووری ئافرەتان، باوکی سەلاح بەرەو ژووری میوان بەڕێکرا، بۆ ماوەیەك لەوێ بەتەنیا مایەوە دوای ئەوە باوکی (هەیفا) هات، پێشوازی لێکردن و بەخێرهاتنی لێکردن، هەردووکیان کەوتنە قسەکردن لەسەر کەشوهەواو ئەو گەندەڵییەی لەنێو لاواندا بڵاوبووەتەوە.. لەپڕێکدا باوکی سەلاح وتی :

((دەمەوێ لەبارەی کارێکی گرنگ قسەبکەم !!)).

((بفەرموون !!)).

((دەمەویٚ(هەیفا)ی کچت بدەیت بە سەلاحی کوڕم )).

بۆ ماوەیەکی کورت بێدەنگیی باڵی کێشا بەسەریانداو پاشان باوکی سەلاح وتی :

((ڕەئیتان چییە ! ؟)).

باوکی (هەیفا) زەردەخەنەیەك گرتی و وتی :

((ئەمە پێویستی بەپرسیار نییە.. بێگومان من ڕازیم، ئێوە چاکترین کەسن !)).

((زۆر سوپاس.. ئەی نرخەکەی چەندە ؟)).

((کچەکەم جوانە.. خوێندەوارە.. ڕازیم لەبەر خاتری تۆ پێت بفرۆشم بە سی وپێنج لیرە بۆ هەرکیلۆگرامێك.

((ئەمە نرخێکی زۆر گرانە !!)).

((ئەگەر دراوسیٚ نەبوویتایە زیاترم داوا دەکرد)).

((باشە، لەبەر ئەوەی دراوسێین داوات لێدەکەم نرخەکەی دابەزێنی)).

سوێند بەخودا داوای هیچ زیادەیەکم نەکردووە، کچەکەم جوانەو خوێندنەوەو نووسینی هەیە، چێشتیش لێدەنیٚ )).

((کچەکەت شایەنی زۆرترین نرخە، بەڵام تۆ دەزانی لەم ڕۆژەدا پەیداکردنی لیرەیەك چەند قورس و گرانە !؟))

((وابزانم ئەو نرخەی پێم وتوویت نرخێکی مامناوەندییەو لەجێگای خۆیدایە)).

((خۆت دەزانیت ئێمە هەژارین، تۆ دەبێت چاوت لە بارودۆخی ئێمەش بێت)).

((نا وانییە، ئێوە دەوڵەمەندن لەڕەوشتی جواندا !!)).

((ڕاستە دەوڵەمەندین لە ڕەوشتی جواندا، بەڵام..)).

باوکی (هەیفا) هەناسەیەکی هەڵکێشاو وتی :

((باشە.. دەتەوێت من چی بکەم !؟؟ ئەوە تاقانە کچمە پێویستە گرنگیی بە دوارۆژی بدەم، سی لیرە باشە بۆ هەر کیلۆگرامێك !؟)).

باوکی سەلاّح ڕەزامەندی بۆ ئەم نرخە تازەیە نیشاندا، بەزوویی (هەیفا)یان نارد بۆ بازاڕ و لەویّ لەسەر تەرازوویەکی گەورە دایاننا، کێشی (پەنجا) کیلۆ دەرچوو، لەکاتێکدا لەولاوە هەلهەلە لێدرا، باوکی سەلاّح پارەکەی پێدان، دوای ئەوە (هەیفا) برایە ئەو ژوورەی بۆ سەلاّح تەرخانکرابوو، دەرگاکە بەباشی داخرا،

بەلاّم دراوسێکان پالّەپەستۆیان بوو، لەسەر ئەوەی لە کونی دەرگاکەوە بڕوانن و بزانن چی ڕوودەدات لە ناو ژوورەکەدا، سەلاّح بە (هەیفا)ی وت :

((ئێستاش بەردەوامیت لە ڕازیبوونت بۆ یارمەتیدانم لەچارەسەرکردنی مەسەلە ژمێرییارییەکاندا !؟؟)).

((ئەی چۆن.. یارمەتیت دەدەم !)).

((زۆر باشە.. بەدایك و باوکم نەلّێیت )). ؟

((بە کەس نالّێم)).

سەلاّح بە دلّخۆشییەوە پێکەنی، لەکاتێکدا (هەیفا) بەرەو دەرگای ژوورەکە دەڕۆیشت، پارچە لۆکەیەکی خستە کونی کلیلەکەوە، وەك ئافرەتێکی پێگەیشتوو کەوتە داکەندنی جل و بەرگەکەی، زۆر بڕوای بەخۆی هەبوو، دوایی لەسەر جێگاکە ڕاکشا، بەدەنگێکی نامۆی فەرمانکردنەوە بەسەلاّحی وت :

((وەرە لێم نزیك بەرەوە، دەمەوێت نهێنییەکت پێبلّێم)).

((قسەبکە.. نهێنییەکە چییە !؟)).

((مەترسە لێم نزیکتر بەرەوە، نامەوێت بەدەنگی بەرز قسەبکەم، نەوەك یەکێك گوێی لێمان بێت !)).

سەلاّح وردە وردە لێی نزیك بوەوە سنگە ڕووتەکەی ناچاریکرد ڕووی پێوە بنووسێنیّ، دوای ئەوە دەمی کەوتە سەر گۆپکەی مەمکەکانی، لەوکاتەدا هەستێکی توند پالّی پێوەنا بۆ ئەوەی گۆی مەمکی بخوا، بەلاّم نەیخوارد، بەلّکو کەوتە گریان چونکە مەمکەکە شیری گەرمی پێنەدا.

# منداڵـەکان

## ـــــــ لەشەودا ـــــــــ

منداڵەکە لە بێهۆشیدا بوو کاتێك جنۆکەیەك لە جێگایەکی تاریك لەژێر زەوییەوە هاتەدەرەوە، بەدەنگێکی ناسك چرپاندی بە گوێیداو وتی :

((دەتبەم بۆ دەریا)).

منداڵەکە بە سەرسوڕمانەوە وتی :

((من نازانم دەریا چییە !؟)).

جنۆکەکە وتی :

((دەریا منداڵێکە حەزی لە ئاوە، دووچاوی شینی هەیە)).

ئەو کاتە منداڵەکە گوێی لە شەپۆلی تووڕەی ئاو بوو، بەدەم پاڕانەوەوە وتی :

((حەزم لەئاو نییە)).

((ئەی حەزت لە چییە ؟)).

((حەزم لەباخە)).

جنۆکەکە بە گاڵتەکردنەوە پێکەنی و پرسیاری لێکرد و وتی :

((بۆچی حەزت لە باخە ؟)).

((باخ سەوزە !)).

جنۆکەکە بە جەختکردنەوە وتی :

((دەتبەم بۆ دەریا)).

ڕوویکردە دەریا منداڵ نەبوو، بەڵکو پیاوێکی باڵابەرز بوو، ناوشان پان لەسنگی گیای سەوز ڕوابوو، منداڵەکە لەرزی لێهات و ترسا، نەیوێرا بگری،

دەریا لە جنۆکەکە نزیك کەوتەوە بەدوو دەستی ئاڵتوونی باوەشی پێداکرد، ئەوکاتە توانەوە وەك خوێیەك بەسەر ئاودا بڵاوی بکەیتەوە، منداڵەکە لەترسا دەلەرزی و لە خەوەکەی بەئاگاهاتەوە، بەدەنگی بەرز گریا،

دایکە نووستووەکەی گوێی لە گریانەکەی نەبوو، بۆ ماوەیەك بە تەنیا دەگریا و لەسەر گازی پشت لەسەر جێگاکەی لێی کەوتبوو،

دوایی وردە وردە لێی خەوتەوە، باخەکە پێکەنی و درەختەکان سەوز بوون، چۆلەکەی بچووك لەسەر دارەکان نیشتنەوە و کەوتنە خوێندن، ڕووبارێك سروودێکی تەڕی بەئاو دەوت، منداڵەکە دڵی خۆش بوو، بەڵام دڵخۆشییەکەی درێژەی نەکێشا، جنۆکەکە گەڕایەوە و بە دووپاتکردنەوەوە چرپاندی بە گوێیدا:

((دەتبەم بۆ دەریا)).

ئەو کاتە جنۆکەکە ئافرەتێکی بووکەشووشە بوو، چاوە گەورەکانی پڕبوون لە ڕق و قین، منداڵەکە قیژەیەکی بەرزی ترسناکی کرد، دایکی لەخەوەکەی بە ئاگاهاتەوە و وایلێکرد بەترسەوە ڕابکات بۆ لای، دوایی بەتەنیشتیەوە ڕاکشا، بەسۆزەوە نووساندی بە سنگییەوە و ئاسایی کردەوە تاوەکو ئارام بووەوە و لەگریان وەستایەوە، بەدەنگێکی نزم هێمنی کردەوە و پەیمانی پێدا ئەگەر نووست دوو جووت کۆتری سپی بۆ دەهێنێ

لەوکاتەدا باخەکە ئافرەتێك بوو لەسەر پشت پاڵ کەوتبوو، بەخۆشییەوە پێدەکەنی، دوو کۆترەکە کەوتنە فڕین لەئاسمانی شینی بەریندا، دوایی کۆترێکی بچووك دوایان کەوت، حەزیان لەئاو نەبوو.

# پەنای مانگ

منداڵەکە بەدایکی وت :

((دوێنێ شەو مانگ لە بەرزاییەوە دابەزی و پەرداخێ ئاوی خواردەوە)).

دایکەکە زەردەخەنە گرتی وتی :

((من کاتی خۆی کە وەك تۆ منداڵ بووم جارێك مانگم بینی پرتەقاڵێکی کردەوە)).

((ئایا مانگ حەزی لە پرتەقاڵە !؟)).

دایکەکە وەڵامی منداڵەکەی نەدایەوە، منداڵەکە جارێکی تر پرسیاری کردەوە و وتی :

((مانگ لە ڕۆژدا بۆکوێ دەچێ ؟)).

((خۆی دەشارێتەوە)).

((لەکوێ ؟)).

((کەس جێگای نازانێ)).

((بۆچی خۆی دەشارێتەوە ؟)).

ئێمە بەشەو دەنووین، مانگیش بەڕۆژ دەنووێت)).

منداڵەکە بێدەنگ بوو و هیچی تری نەوت، بەڵام ئەو لەو کاتەوە بڕیاریدا بگەڕێت بەدووی پەنای مانگدا کە گەورە بوو.

## دەستی بچووك

منداڵێك پشیلەیەكی سپی هەبوو، حەزی دەكرد قسەی لەگەڵ بكات، ڕۆژێك لە ڕۆژان پشیلەكە میاواندی وتی:

((كوخێكم بۆ بكڕە !)).

((تۆ حەزت لەوەیە لە ڕێگاوبان بژیت ؟ پێویستت بە كوخ نییە)).

((من حەزم لەوەیە بە شەوان بە ڕێگاوباندا هاتووچۆ بكەم، بەڵام بە ڕۆژ حەزم لەوەیە لەجێگایەكی بێدەنگی ئارام دا بنووم)).

منداڵەكە پێی وت :

((من بچووكم پارەی كوخم نییە !!)).

((كەواتە كوخێكم بۆ دروست بكە)).

((من بچكۆلەم و دەستەكانیشم بچكۆلەن توانای دروست كردنی كوخم نییە)).

((پشیلەكە تووڕەبوو، ئیتر لەوكاتەوە قسەی لەگەڵ منداڵەكە نەكرد، لەبەر ئەوە منداڵەكە ناچاربوو هاوڕێیەكی تر لەنێو منداڵە بچووكەكاندا بۆ خۆی هەڵبژێرێ.

## ـ تـــــەم ــ

منداڵەکە بەبێ هۆکار درێژەی دا بە پێکەنینەکەی، دایکی بە خۆتێهەڵقورتاندنەوە پرسیاری لێکرد و وتی :

((بۆچی بێدەنگی ؟)).

منداڵەکەش وتی :

((ڕووبارەکە ناوم دەزانێ ؟)).

دایکەکە وەڵامی دایەوە :

((ڕووبار قسەناکات، ئەو تەنیا ناوی بۆق و ماسی دەزانێ)).

منداڵەکە بە بڕواکردنەوە وتی :

((ڕووبارەکە ناوم دەزانێ، ئەو منی خۆشدەوێت)).

(( لەڕووبار نزیك مەکەوە ئەو منداڵی بچووك دەفڕێنێ)).

منداڵەکە بەسەرسوڕمانەوە سەری ڕاوەشاند، ئەو لەوەوپێش بیستبووی ڕووبارەکە بە چرپەو سۆزەوە ناوی ئەوی هێناوە، دەنگی زۆر بەسۆز و ناسك بوو وەك بۆنی یاسەمین، بۆ ماوەیەك منداڵەکە بێدەنگ بوو دوایی بە دایکی وت :

((هەورەکەی دزی !!)).

دایکەکە وتی :

((درۆ شورەییە !)).

((من درۆ ناکەم.. هەورەکەی دزی !)).

منداڵەکە بە دەستەکانی ئاماژەی بۆ سەرەوە کرد، کە هەورەکە کۆبووبووەوە لەئاسماندا پاشان وتی :

((من یەکێکم لەم هەورانە دزیوە)).

((چۆن ! ؟.. هەور بەرزە و تۆ بچووکی !)).

((بەهەورم وت وەرە، لەو بەرزاییەوە شۆڕبووەوە)).

منداڵەکە لەپی دەستی کردەوە، پارچەیەك لۆکەی سپی لەناو لەپی دەستیدا بوو، دایکی پێکەنی و وتی :

((ئەمە هەورە !!؟؟)).

منداڵەکە بەدەنگێکی پڕ لە خۆشییەوە وتی :

((نەمتوانی هەموو هەورەکە بدزم، چونکە ئەو گەورەیە، ڕازیبووم بە بەشێکی)).

## — هاوڕێم ڕۆژ —

مندالّەکە نەیتوانی لە هەولّەکەیدا بەرامبەر ڕووناکی ڕۆژ چاوەکانی هەلّبێنیّ، بە دلّتەنگییەوە سەری دانەواند و بەدایکی وت :

((ڕۆژ ڕقی لەمنە !!)).

دایکەکە پێی وت :

((ڕۆژ هەموو خەلّکی خۆش دەوێت )).

مندالّەکە بە پێداگرییەوە وتی :

((ڕۆژ منی خۆش ناوێت !!)).

ئەو ڕۆژە بەسەرچوو بە هەنگاوی لەسەرخۆ ڕۆیی و ڕەنگی زەردی لەگەلّ خۆی ئاواکرد، لەشەودا بارانێکی زۆر باری بەیانیش بە سپێتی و تەڕییەوە هات.

مندالّەکە بەخۆشییەوە هاواریکرد، چۆلەکەیەکی بچووکی لە حەوشەکەیاندا دۆزییەوە لەسەرماندا دەلەرزی، بارانەکە تەڕی کردبوو، پەلەی کرد لەپێدانی خواردن لەپارچەنانەکان بە چۆلەکەکە، بەلاّم چۆلەکەکە بێهێز بوو لەسەرمانا و لەترسانا دەلەرزی، بۆ مندالّەکە ئاشکرابوو کە چۆلەکەکە لەهەر کاتێکدا بمریّ ئەوا دەمریّ، ترس و دلّەڕاوکیّ گرتی، بەلاّم هەر کە هەورە ڕەشتالّەکە لەئاسمان ڕەوییەوە و ڕۆژ دەرکەوتەوە، ئیتر چۆلەکەکە بەخۆشییەوە کەوتەوە جریوە جریو،

ئەوەندەی پێنەچوو چۆلەکەکە بە باڵەکانی کەوتە باڵەفڕێ، منداڵەکە بەترس و سوپاسەوە ڕوانییە ڕۆژەکە و ماڵئاوایی لێکرد... ئەویش بە ڕووە ئاڵتوونییەکەیەوە زەردەخەنەیەکی بۆ کرد، زەردەخەنەیەکی هەڵبژارد کە ئاماژەبێت بۆ ئەوەی هەتاهەتایە خۆشی بوویت.

## ــــ ئاسكێكی بەند كراو ــــ

منداڵەكە لەڕێگایەكی پڕ لە دەنگەدەنگ و هەراو زەنا كەوتە ڕۆیشتن، پەنجەكانی بچووك و دەترسان، بەحەزەوە دەستی دایكی گرت، لەپڕێكدا لەڕۆیشتن وەستاو قیژاندی :

((ئەمە چییە !؟؟)).

بەدەستەكانی ئاماژەیكرد بۆ دوكانێك كە مریشك و پەلەوەری دەفرۆشت، لەوێدا ئاسكێك وەستابوو و تەوقێكی قایشی لەملدابوو بۆ ئەوەی بەرنەبێت و هەڵبێت، دایكەكە وتی :

((ئەمە ناوی ئاسكە !!)).

((لەكوێوە هاتووە !؟)).

((لەبیابانەوە )).

((ئەی بیابان چییە ؟)).

((بیابان جێگایەكی پان وبەرینە، زەوییەكەی لماوییە)).

((ئەی لم چییە ؟)).

((لم دەنكی وردە، ناسكە، ڕەنگی زەردە)).

((ئەی ئاسك بۆچی هاتووە بۆ ئێرە ؟)).

((ڕاوچییەكان هێناویانە بۆ ئێرە بۆ ئەوەی بیفرۆشن)).

((ئەوەی دەیكڕێت چی لێدەكات ؟)).

((سەری دەبڕێت، گۆشتەكەی خۆشە !!)).

منداڵەکە بۆ ماوەیەك سەیری ئاسکەکەی کرد، کە بە ترسەوە ڕاوەستابوو، جوان و ڕەنگی ئاڵتوونیی بوو، چاوەکانی بە ماڵئاواییەوە حەزیان لە گریان بوو.

منداڵەکە لەرزی لێهات، هەستیکرد ڕۆژێ لە ڕۆژان ئاسك لە بیابانە پان و بەرینەکاندا ڕادەکات، دەستیکرد بەگریان، لەوکاتەدا لە مێشکی منداڵەکەدا بیابان زەوییەکی پان و بەرینە و لمی زەرد داپۆشیوە و کەسی تێدا ناژی لە ئاسك و ڕاوچییەکان زیاتر.

# دوا ئاڵاکان

بەسۆزەوە سەیری پێڵاوەکانم دەکرد، لەکاتێکدا بۆیاخچییە پیرەکە سەرقاڵی پاکردنەوە و بریقە لێهێنانی بوو، پێش دوومانگ کڕیومە بە سی و پێنج لیرە، ئێستا ناتوانم بیفرۆشمەوە بەو نرخە.

ئەوە خەڵکی زەوییە هەر هەموویان کارەکانیان جێهێشتووە، بەبێدەنگیی چواردەوریان داوم، من پیاوێکم مێزەرێکی سپی دەخەمە سەرسەرم، ڕیشم ڕەش و درێژە، دەنگێکی پیاوانەم هەیە، پێکهاتەکەی بەرزبوونەوە و کاریگەریی هەیە، بەرزدەبێتەوە :

((کوڕەکانم.. پێڵاو وەك ئافرەت وایە لەلایان)).

حەزم لەوە دەکرد گوێم لە دەنگی خۆم بێت، بە بۆیاخچییەکەم وت :

((ساڵی ڕابوردوو، ساڵی خێر بوو !!)).

ئەویش پێی وتم :

((ڕۆژی حەشر نزیکە !!)).

پێموت :

((ئەوەی دەیڵێیت ڕاست نییە، ساڵی پار ساڵی خێر بوو، پشیلەکەمان پێنج بێچووی بوو )).

پێی وتم :

((پشیلە جوانە !!)).

ئاگاداریکردمەوە پشیلەیەکی بەخێوکردووە هەستی بە فەقیرییەکەی کردبوو، خواردنی لە خواردنەکانی ئەو نەدەخوارد، بەڵکو لە دراوسێکانی دەدزی، پێکەنیم و پێموت :

((من پشیلەیەك دەناسم حەزی لە پشیلەیەك كردبوو بۆ ماوەی سێ ساڵ دڵسۆزی بۆ دەردەبڕی، پێی وتم :

((خواكەریمە)).

پێم وت :

((ئەوەی بۆم گێڕایتەوە سەرسوڕهێنەرە !؟)).

پێیوتم :

((ئەوە جێگای سەرسوڕمان نییە، چونكە ئاژەڵ بوونەوەرێكی جوانی خودابیەو خودا دروستیكردووە، تەنیا عەیبیان ئەوەیە، كە بە چوارپێ دەڕۆن)).

ئەوكاتە بێدەنگ بوو تاوەكو لە پاككردنەوەی پێڵاوەكانم تەواو بوو، پارەكەم دایە و بەشەقامەكاندا هاتووچۆم دەكرد و بیرم لەو خەڵكە دەكردەوە، كە دەهاتن و دەچوون بەچواردەورمدا بەچوارپێوە، بە گاڵتەجارییەوە پێكەنیم بەڵام نێوچەوانم گرژو چرچ كرد، لەكاتێكدا ڕوانیم منداڵێكی بچووكی حەڵوافرۆش بەگومانەوە بۆم دەڕوانیێ، لێی نزیك كەوتمەوەو سێ پارچە حەڵوام لێكڕی، بەڵام ئەو گومانەكەی هەر مابوو، ڕقم لێی هەستا، بە هەنگاوی بەپەلە كەوتمەوە ڕۆیشتن، لاڕێیەكەم گرت، لەوێدا حەڵواكەم فڕێدایە سەر زەوی، بەپەلە پیاوێكی پۆلیس گرتمی و بردمی بۆ پۆلیسخانە، لەوێ پشكنینیان بۆ حەڵواكە كرد، بۆیان دەركەوت كە ژەهراوییە، پیاوانێكی زۆر لێم كۆبوونەوە، داوایانلێكردم ناوی تەنینەوەی نەخۆشییەكە چییە ؟ منیش پێموتن كە هیچ تەنینەوەیەكم نییە، پیاوەكان بە گاڵتەو ڕازینەبوونەوە تێیانڕوانیم، ئامۆژگارییان كردم كە ڕاستی بڵێم و هانا بۆ درۆو دەلەسە نەبەم، وتیان ئەوان هەموو شتێكی من دەزانن، چونكە ماوەیەكی زۆرە لەژێر چاودێریدام، هاوارێكی سەرسوڕمانم كرد، بەڵام ئەوان گوێیان پێنەدا، پیاوێكی بەرگ جوانی ڕیش تاشراویان هێنا، وتیان ئەوە ئەو دوژمنەیە، كە تۆ دەتویست لەناوی ببەی لەڕێگای دەرخواردانی ئەو پارچە حەڵوا ژەهراوییەوە، منیش قیژاندم وتم :

((ئەو دوورە لەڕاستییەوە !)).

ئەو کاتە پیاوە دەوڵەمەندەکە کەوتە قسەکردن و وتی :

((تۆ هەڕەشەی کوشتنی منت کردووە، ئەگەر ڕەزامەندی نەدەم بە شووکردنی کچەکەم بە تۆ !؟)).

پێم وتن :

((من کچەکەیم خۆشدەوێت و ئەویش گەورەترین خۆشەویستی هەیە بۆ من)).

دوایی بە تووڕەییەوە بەسەر کابرای دەوڵەمەندا قیژاندم :

((تۆ خۆشەویستییەکەی ئێمەت تێکشکاند، بەزۆر دەتەوێت جیابینەوە، چ زیانێکی هەیە ئەگەر هەژارێك کچە دەوڵەمەندێك بهێنێ ؟ پیاو ئەوەی کە دەتوانێ منداڵ دروست بکات و تۆ بکاتە باپیرە !)).

پیاوەکان کە گوێیان لەقسەکانم بوو سەیری یەکتریان دەکرد، چونکە قسەکانم مانایان هەبوو، من بەردەوام بووم لە قسەکردن :

((پێویستە جیاوازی نەمێنێ لەنێوان هەژارو دەوڵەمەنددا)).

لەوکاتەدا خەڵکی سەر زەوی کارەکانیان جێهێشت و بەچواردەورمدا بە بێدەنگیی ڕاوەستان، منیش بە دەنگێکی لەرزۆکەوە، کە حەزم لەگریان بوو پێموتن :

((ئەی براکانم پێویستە لەسەرتان ئەو دیوارە بڕوخێنن، کە مرۆڤ لە مرۆڤ جیادەکاتەوە)).

لێکۆڵەرەوەکان داوایانلێکردم بێدەنگ بم، دوایی داوای سەرتاشێکیان کرد، پاش تۆزێك پیاوێکی بەرگ سپی هاتە ژوورەوە، بەجانتاییێکی ڕەشەوە هیچ قسەیەکی نەکرد تەنیا جانتاکەی لەسەر مێزەکە دانا، دواتر کردییەوەو خاولییەکی سپی دەرهێناو پێچای لە ملی منەوە، گوێزانێکی لە جانتاکەی هێنایە دەرەوە، بە پارچەیەك قایشی چەورکراو بە زەیت تیژیکردەوە، لێم نزیك کەوتەوەو داوای لێکردم نەجوڵێمەوە و هەناسەنەدەم، منیش بەگوێم کرد، ئەویش بە جووڵەیەکی توند سەریبڕیم، سەرم کەوتە سەر زەوی و ئازارم پێگەیشت و هەستامە سەرپێ،

سەرتاشەکە پێی وتم :

((پیرۆزت بێت !!)).

نەمتوانی وەڵامی بدەمەوە، بە ڕاکردن لە پۆلیسخانەکە چوومە دەرەوە، بەشەقامەکاندا ڕامدەکرد بەرەو ماڵەوە، کاتێك گەیشتمە ماڵەوە، دایکم قیژاندی :

((کوانێ سەرت !! ؟؟)).

وەڵامم نەدایەوە، چونکە بێ زمان بووم، هەروەها وتی :

((کەواتە ناتوانی بچیت بۆ لای پزیشکی ددان !؟)).

زۆر دڵتەنگ بووم، چونکە ئەمڕۆ من ناتوانم بچم بۆ لای پزیشکی ددان بۆ چارەسەرکردنی ئەو ددانە کرمێییەم، بەڵام پاش تۆزێك دڵخۆش بووم، بەوەی ئیتر پێویستم بەوە نییە کە بچم بۆ دوکانی سەرتاشخانە.

## سەوزە

ئافرەتەکە لە ناو باخچەکەدا ڕاوەستابوو، لە بەرزاییەوە مانگێك لەبەردی زەرد دەیڕوانی بەسەریدا، هەردوو پێیەکانی بەڕووتی لە خۆڵدا چەقیبوون، گۆرانییەکی زبری نەگەییو دەهاتە بەر گوێی، سەری بۆ نەویکرد، لەوکاتەدا ترس مەلێکی سپی بوو، ملی قرتابوو، لەشی ئافرەتەکە کەوتە لەرزین، چاوەکانی پڕبوون لە فرمێسك، نەختە نەختە گۆشتەکەی ڕەق دەبوو ڕەگ لە پێیەکانی ڕوا، خۆڵە وشکەکە قلێشی برد، چووە نێوی، لەکاتێکدا ئافرەتەکە بەسەری نەوییەوە بەردەوام بوو لەگریان، لە پڕێکدا هاوارێکی پڕ ترسی شاراوە بەرزبووەوە، دەستەکانی بەرزکردەوە بۆ سەرەوە، بەمەبەستی خۆڕزگارکردن لە خۆڵەکە، بەڵام هەردوو دەستی وشك بوون و بەبەرزییەوە مانەوە، بەڵام لەشی بەملاو ئەولادا دەهاتودەچوو، هێواش هێواش فرمێسکی چاوەکانی وشك بوون، گۆشتەکەی بووە تەختەیەك و توێژاڵێکی گرتەخۆ، دوایی وەرزی زستان هات، باراناو ئافرەتە چەقیوەکەی نێو خۆڵەکەی شتەوە، پاشان وەرزی بەهار هات، گەڵای سەوزی بچووك لەدەستەکان و قژی ئافرەتەکە پشکووت، ئەوەندەی نەبرد گوڵێکی گەورە دەرچوو.

ڕۆژی هاوین پەرش بووەوە بەسەر باخچەکەدا، ئینجا خاوەنی باخچەکە هات، پیاوێکی پیر بوو، درەختی سێوەکان لە باخچەکەدا لق و پۆپەکانیان پڕبوون، تەنیا یەك درەختیان نەبێت گوڵەکەی نەبوو بە سێو، لێی بێزار بوو، بەپەلە تەورەکەی ئامادەکرد و کەوتە لێدانی پەلەکانی درەختەکە، یەك لەسەر یەك لێی دەدا تاوەکو درەختەکە بە مردوویی کەوتە سەر زەوی.

# بەزین

(خەلیل سامر) گەڕایەوە بۆ ژوورەکەی، پشتی کۆماوە و قاچەکانی ماندوو، لەسەر جێگاکەی ڕاکشا، بەتەنیا و سەرمابردوو دەلەرزی، چاوی چووە خەو لە کاتێکدا ڕەشەبا لە دەرەوەی ژوورەکە دەنگی گورگێکی پیری برسی بوو، پاش تۆزێك ڕەشەباکە گۆڕڕا بۆ دەستێك پەنجەکانی دەلەرزین، دەرگای ژوورەکە کرایەوە، شاژنێکی قژڕەش خۆیکرد بە ژووردا، باڵای لە لووت بەرزی ڕمێکی تووڕە دەچوو، فەرمانی پێکرابوو (خەلیل سامر) ئازار بدات تاکو مردن، لەپڕێکدا دەنگێك دەیوتەوە :

((ئازاری دەدەین !)).

((خوێ دەکەینە چاوەکانی)).

((گۆشتەکەی دەبرژێنین)).

((ئێسقانەکانی تێکدەشکێنین)).

(خەلیل سامر) بە ترسەوە دەلەرزی، ترسەکەی گۆڕڕا بۆ سەرسوڕمانێکی زیانبەخش،، کە بینی شاژنە پرچ ڕەشەکە لەپڕ قاچ دەنێت بە ئەژنۆکانیدا، بەدەم پاڕانەوەوە دەقیژێنێ :

((ڕاکە.. ڕاکە)).

(خەلیل سامر) پرسیاریکرد و وتی :

((بۆ کوێ ڕاکەم ؟)).

سیمای شاژن بوو بە ئازارێکی ستەمکارانە، کەوتە سەر زەوی و مرد، گۆڕڕا بۆ پەپوولەیەك و لەناو بۆشاییەکی تاریکدا ونبوو، (خەلیل سامر) بەردەوام بوو لە هەنسکدان بێ ئەوەی فرمێسکی هەبێ، تاوەکو بەیانییەك لەخەو هەستا وایدەزانی پێیەکانی درێژدەکا و باوێشك دەدات، وەك ئەوەی سەدساڵ بێت نووستبێ و گەدەی کیسێکی بەتاڵی کۆنە، لەماڵ چووە دەرەوە.

ماڵەکە دەرگایەکی تەختەی هەبوو، لەدوای خۆی بەتوندی دایخست، کەوتە ڕۆیشتن بە شەقامێکدا دوو پیادەڕەوی هەبوو، ئاسوودەیی باڵی کێشابوو بەسەریدا، لەکاتی ڕۆیشتنیدا نە پیاو نە منداڵ نە ئافرەتێکی نەبینی، لەسەر بالکۆنەکە، پیادەڕەوەکان بە چینێك لە گەڵای زەردی درەخت داپۆشرابوون و پشتگوێ خرابوون، (خەلیل سامر) بەردەوام بوو لە ڕۆیشتنەکەیدا بە هەنگاوی لەرزۆك و جۆرێك لە خۆدواخستنیشی پێوەدیار بوو، تاکو گەیشتە یەکێك لە چێشتخانەکان، کاتێك ویستی بچێتە ژوورەوە بەرەو ڕووی مشکێکی گەورە بووەوە کە سواری پاسکیلێك بووبوو، زەردەخەنە گرتی و بەسەرسوڕمانەوە سەیرێکی ئاسمانی شینی ڕوونی کرد، پاشان چووە ناو چێشتخانەکەوە، لەوێ ژمارەیەکی زۆر مشکی بینی، هەرهەموویان قەبارەیان گەورە بوو، لەپشتی مێزە تەختەکانەوە دانیشتبوون، بەشێوەیەکی سەیر خواردنیان دەخوارد.

(خەلیل سامر) مێزێکی لە سوچێکەوە بۆ خۆی هەڵبژارد، بە تەریقی و تێکچوونەوە لەسەری دانیشت، چاوی بڕییە بەرگە پیسەکەی و کەوتە ژماردنی ئەو پەڵە پیسانەی لەسەری بوون، ژماردنی شەش پەڵە بوون.

دوای تۆزێك کارگوزارەکە هات بۆ لای، کە مشکێکی گەورە بوو، بەرگێکی ڕەش و کراسێکی سپی یەخە دامەزراوی لەبەربوو، (خەلیل سامر) بە سەرسامییەوە کەوتە تێڕوانینی، پاشان سەری دانەواند و لەدەمییەوە دەنگێکی زبری درێژ وەك وەڕینی سەگێك بوو لەسەرەمەرگدا، (خەلیل سامر) وتی :

((کوپێك شیرو دوو کولێرە و پارچەیەك پەنیر و تۆزێك کەرەم دەوێ)).

کارگوزارەکە سەری بۆ دانەواند و لەمێزەکە دوورکەوتەوە، (خەلیل سامر) چاوەکانی لێکنا، هەوڵیدا وەك منداڵێکی قژ زەرد بێت، بەناسکییەوە پێدەکەنی، بەڵام سەرکەوتوو نەبوو، هەوڵیدا وەك درەختێکی سەوزو مەلێکی بچووك و ئافرەتێکی قژ ڕەش بێت، بەڵام هەر سەرکەوتوونەبوو، بە ددانەکانی لێوی خوارەوەی گەست، لەوکاتەدا کارگوزارەکە گەڕایەوە، قاپێکی لەسەر مێزەکە دانا، کە پارچەیەك گۆشتی کاڵی لەسەر بوو، (خەلیل سامر) ناڕازیبوو، بەدەنگێکی تووڕەیی و بەرز وتی :

((ئەمە چییە ؟؟ من داوای کوپێك شیرم کردووە)).

کارگوزارەکەش بە قیژەیەکی هەڵەشەییەوە قسەکەی پێبڕی، بەڵام (خەلیل سامر) بەردەوام بوو و وتی:

((داوای کۆپێك شیرو دوو نان و پارچەیەك پەنیر و تۆزێك کەرەم کردووە، نەك گۆشتی کاڵ !!)).

کارگوزارەکە وەڕی، مشکە گەورەکانی کە لە پشتی مێزەکەی ئەولاوە دانیشتبوون کەوتنە وەڕین، وەڕین قاقایەکی درێژی گاڵتەئامێز بوو، (خەلیل سامر) زۆر تووڕەبوو، ویستی قسەبکات و نارەزایی دەربڕێ، بەڵام وشەکان لەقوڕگیدا ونبوون و شارانەوە، هیچی لەدەم دەرنەچوو تەنیا وەڕینێکی پچڕپچڕی شپرزە نەبێت، بۆ ماوەیەك چاوی داخست، ئەو کاتە بینی شاژنە قژ ڕەشەکە کەوت و مرد، دوای ئەوە نەگۆڕرا بۆ پەپوولە، بەڵکو لاشەیەکی زەردهەڵگەڕاو بوو لەسەر زەوی ڕاکشابوو.

بەقورساییەوە (خەلیل سامر) چاوەکانی هەڵهێنا، کە ڕوانی پارچە گۆشتێکی نەکولاو لەبەردەمیدایە، لەپڕێکدا حەزی لەخواردن کرد، دەستی بۆ ڕاکێشا، پەنجەکانی لێ توندکرد و بەرزیکردەوە بۆ دەمە کراوەکەی، بە ددانە کرمێکانی کەوتە خواردنی، لەو کاتەدا مشکێکی پۆشاك ڕێك و پێك خۆیکرد بە ژووردا، بەدوای خۆیدا منداڵێکی قژ زەردی ڕادەکێشا، لەسەر دەستەکانی و قاچەکانی دەرۆیشت و زنجیرێکی ئاسنینی لە ملدا بوو.

# درۆ

مامۆستاکە وانەکەی بەم شێوەیە بۆ قوتابییەکان تەواوکرد و وتی :

((ئێستا ئێوە دەزانن گەورەترین شت لەمرۆڤدا لە سەریدایە، ئاگاداربن ئەم ڕاستییەتان لەیادنەچێ)).

قوتابییەکان تێڕوانینی سەیریان دەگۆڕییەوە و چاودێری مامۆستایان دەکرد، لە کاتێکدا لە هۆڵی وانە وتنەوەکە بە باڵایەکی بەرزەوە دەچووە دەرەوە، سەری بەرزکردبووەوە، بۆ ماوەیەك بێدەنگ بوون و ئەوەندەی پێنەچوو هەستان و کورسییەکانیان جێهێشت، بە ڕاکردن چوون بۆ حەوشەی قوتابخانەکە، لەوێ وەك جاران یارییان نەکرد، بەڵکو کۆبوونەوە بۆ لێدوان لەسەر قسەکەی مامۆستاکە.

دەنگە بەرزەکانیان بەردەوام بوو، بەگوڕو تینێکی گەرمەوە قسەیان دەکرد تاکو زەنگی دەست پێکردنەوەی وانەی نوێ لێدرا، گەڕانەوە بۆ هۆڵی وانە خوێندن، لەسەر تەختەی دانیشتنەکان دانیشتن و بە حەزو خولیاوە چاوەڕێی مامۆستایان دەکرد، بەڵام مامۆستا ئامادەنەبوو، بەڵکو بەڕێوەبەرە نێوچەوان گرژەکەی قوتابخانە ئامادەبوو، بە لەخۆباییبوونەوە ئاگاداریکردنەوە، کە مامۆستاکەیان لەپڕێکدا تووشی ژانەسەر بووە، بە دەنگێکی زبرەوە داوایلێکردن کاتی وانەکە بە خوێندنەوەی (10) لاپەڕە لە کتێبی مێژوو ببەنەسەر، ئامۆژگاریشی کردن، کە تەمبەڵی نەکەن و ئامادەنەبوونی مامۆستاکەیان بە هەل نەزانن.

بەڕێوەبەرەکە لە هۆڵی وانە خوێندنەکە نەچووبووە دەرەوە، کە قوتابییەکان کەوتنە قسەکردن و لێدوان :

((مامۆستا درۆ دەکات !!)).

((مامۆستا درۆی نەکردووە !!)).

یەکێك لە قوتابییەکان بە بڕوابەخۆبوونەوە قیژاندی :

((سەر هەیە تەنیا بۆ هەڵگرتنی دوو چاو و لووتێك و برۆکان و قژ و گوێچکەکانە)).

وتووێژ درێژەی کێشا و گەرم بوو، دوایی کۆتایی پێهات بەرێکەوتن لەسەر ئەوەی تاقیکردنەوە بەتەنیا توانای پێدانی چەسپاندنی هەیە بە درۆ یان ڕاستگۆیی مامۆستا.

قوتابییەکان یەکێکیان لەخۆیان هەڵبژارد، کە بچووکترینیان بوو، چاوەکانی شین و قژی زەرد، پەلەیکرد لە ڕاکشان لەسەر زەوییەکە بە پێکەنین و فەخرەوە، قوتابییەکان بە قەمەیەکی تیژ سەریان لە لەشی کردەوە و سەرەکەیان هەڵگرت، لە کونی ملییەوە سەیری ناوەوەیان کرد، کە قرتاندبوویان، لە تاریکی زیاتر هیچیان نەبینی، دوایی بەپەلە بەردێکیان لە حەوشەی قوتابخانەکە ئامادەکرد، بەردێکی تۆکمەو پتەوە، سەرەکەیان لەسەر زەوی هۆڵی وانە وتنەوەکە دانا، بە بەردەکە کەوتنە لێدانی تاکو شکاندیان، کاتێك کە سەیریان کرد چی تێدایە بە گاڵتەجاڕییەوە کەوتنە پێکەنین، بەبێزارییەوە کەوتنە تێڕوانینی دڕکە مۆخەکەی، کە لە دڕکەمۆخی مەڕ دەچوو، کە بەکاڵی لە دوکانەکانی قەسابەکاندا دەفرۆشرێت، بە لێبووردنەوە سەریان ڕاوەشاندو بە بڕوابەخۆبوونەوە وتیان :

((مامۆستا درۆی کرد)).

دوایی که تیرەیان هێنا و پارچە سەرەکەیان پێکەوە نووساندەوە و سەرەکەشیان بە لاشەکەیەوە نووساندەوە، کە لەسەر زەوییەکە کەوتبوو، کەوتنە گۆڕینەوەی بیروڕا لەگەڵ یەکتردا، کە نیشانەی سەرکەوتنیان بوو، پاشان دووپاتیانکردەوە :

((مامۆستا درۆی کرد)).

یەکێکیان مشتەکۆڵەیەکی بە بچووکە چاوشینە قژ زەردەکەدا کێشا لەپڕێکدا هەستایە سەرپێ، بەخۆتێهەڵقورتاندنەوە قیژاندی :

((ئایا مامۆستا درۆی کرد !!؟؟)).

# لەڕۆژێكی خۆشیدا

من و خوشكەكەم چووین بۆ بازاڕ، دوكانێكمان دەستنیشانكرد، كە منداڵی دەفرۆشت، بە هەنگاوی پچڕ پچڕ و تەریقییەوە چووینە ناوەوە، كەوتینە سەیركردنی منداڵەكان لە هەموو تەمەنە جۆراوجۆرەكان، كە لەنێو سندووقە تەختە بچووكەكان لەسەر پشت ڕاكشابوون، لەپڕێكدا بەخۆشییەوە خوشكم هاواریكرد :

((وەرە سەیركە !!)).

بە پەنجەی ئاماژەی بۆ منداڵێك كرد، كە تەمەنی لە دوو ساڵ تێپەڕینەدەكرد، ڕووی سپی و قژی ئاڵتوونی، سەیری منی كرد و وتی :

((ئەم منداڵە دەكڕین)).

چاوەڕێی وەڵامی منی نەكرد و بەرەو لای فرۆشیارەكە ڕۆیشت، بەدەنگی بەرز پرسیاری نرخی منداڵەكەی لێكرد، لێوەكانی جوڵاند بێئەوەی من گوێم لێی بێت، كەچی خوشكم هاواریكرد :

((نەء.. نەء، ئەمە نرخێكی زۆر گرانە !!)).

فرۆشیارەکە زەردەخەنە گرتی و سوێندی خوارد، کە نرخەکەی لەبارو گونجاوە، خوشکم بە خۆسوورکردنەوەوە سوێندی خوارد کەنرخەکەی بەهیچ جۆرێك هەرزان نییە، هەردووکیان کەوتنە چەندوچوونێکی دوورو درێژ تاکو پێکەوە ڕێکەوتن، خوشکم پارەکەی داو بەپەلە بەرەو ڕووی منداڵەکە چوو،

هەڵیگرت و نووساندی بەسنگی خۆیەوە و بەپەلە لە دوکانەکە چووینە دەرەوە، منیش بە تووڕەییەوە دوایکەوتم، لەکاتی ڕۆیشتندا لە شەقامەکە پێی وتم :

((سەیرکە، سەیرکە.. چەند جوانە !!)).

منیش سەیری منداڵەکەم کرد، کتوپڕ ڕوانیم بە دووچاوی تیژو ڕقاوییەوە تێمدەڕوانیٚ، کاتێك گەیشتینە ماڵەوە خوشکم منداڵەکەی لە سەر سەرینەکە دانا و پێی وتم :

((دەچم خواردنی بۆ دێنم بۆ ئەوەی بیخوات)).

هەرکە ئەو چووە دەرەوە منداڵەکە ڕووی بەلامدا وەرچەرخاند، بە دەنگێکی هێمنییەوە پێی وتم :

((هەرکە گەورە بووم دەتکوژم !!)).

ویستم هەستم و ڕاکەم بەڵام نەمتوانی لەجێگای خۆم بجولێم، خوشکم گەڕایەوە بۆ ژوورەکە، خۆشی لەسیمایدا دیار بوو، منیش ئەو کاتەم قۆستەوە و بەهەڵم زانی بەپەلە لەماڵ چوومە دەرەوە، بەسەرشۆڕییەوە لە شەقامەکان مامەوە تاکو نیوەی شەو پاشان چووم بۆ ئەو مەیخانەیەی کە حەزم لێبوو، لەویٚ چەند پێکێکم لە عارەق خواردەوە، کەوتمە قسەکردن لەگەڵ هەندێك سەرخۆش، کە لەوەوپێش ناسیاویم نەبوو لەگەڵیاندا، یەکێکیان بۆی گێڕامەوە کە چەند ڕۆژێك لەمەوپێش لە بەندینخانە بەربووە، پرسیاری تاوانەکەیم لێکرد، وتی:

((خوشکم سەربڕیوە و لاشەکەیم فڕێداوەتە نێو ڕووبارەکەوە)).

((بۆچی سەرت بڕیوە !؟)).

((لەبەر ئەوەی برسی بوو تێری نەدەخوارد !!)).

درەنگانێکی شەو گەڕامەوە ماڵەوە، سەیرم کرد منداڵەکە لەتەنیشتی خوشکمەوە خەوتووە، بەهێواشی هەڵمگرت بۆ چێشتخانەکە و لەسەرخۆ لەسەر مێزە تەختەکە دامنا بۆ ئەوەی بەئاگا نەیەتەوە، زۆر گەڕام بۆ چەقۆیەك، چەقۆیەکی کوڵ دۆزییەوە، بۆیە زۆر بەناڕەحەتی توانیم گۆشتەکەی پارچەپارچە بکەم، گۆشتەکەی زۆر نەرم و شل بوو، کە لێبوومەوە هەناسەیەکی سەرفرازیم هەڵکێشا، پارچە گۆشتە خوێناوییەکانم خستە ناو کیسەیەکی کاغەزەوە و بردمە دەرەوە و فڕێمدایە بەردەمی پشیلەکان، سەگەکانیش بەدوامدا ڕایاندەکرد و دەوەڕین، دوایی بەرەو پۆلیسخانە ڕۆیشتم، لەکاتێکدا سستی ولاوازی دەچووە نێو تاریکی شەوەوە.

هەستم دەکرد پۆلیسخانەکە گۆڕێکی گەورەیە، هیچ تێکنەچووم یاخود دوودڵ نەبووم بۆ یەك چرکەش، بەڵکو بە خواستی خۆم چوومە ژوورەوە و بەهەنگاوی جێگیرو هێواش، پۆلیسێك ڕێگای لێگرتم و بەم شێوەیە پرسیاری لێکردم :

((چیت دەوێ !؟؟)).

((دەمەوێ سەرۆکی پۆلیسخانەکە ببینم)).

((بۆچی دەتەوێت بیبینیێ؟))

تاوانەکەم بۆ گێڕایەوە و بردمی بۆ یەکێك لە ژوورەکان، لەوێ ڕوانیم سەرۆکی پۆلیسخانە خەریکی خواردنی بەلەزەتە، تاوانەکەم بۆ ئەویش گێڕایەوە و دەستە خوێناوییەکانم نیشاندا، دوای ئەوەی کە هیچ نەما بیڵێم، سەرۆك بە تێکچوونەوە بێدەنگ بوو، دوای ئەوە کەوتە پێکەنین، هەستمکرد کە لە بەرزاییەوە دەکەومە خوارەوە، بە گاڵتەپێکردنەوە پێی وتم :

((کەواتە منداڵێك کە تەمەنی دووساڵان بوو قسەیکرد !! ؟؟)).

منیش بەدەم پاڕانەوەوە وتم :

((بەڵێ سوێند دەخۆم کە منداڵەکە قسەیکرد، ئەگەر نەمکوشتایە.. دەیکوشتم، سوێند دەخۆم)).

بەتوندی قسەکەی پێبڕیم و وتی :

((بێدەنگ بە.. ئێستا چیت دەوێ ؟)).

((دەمەوێ بدرێم بە دادگا !!)).

((چی لەدادگا چاوەڕێ دەکەیت ؟)).

((سزادەدرێم بە سزای خنکاندن)).

((ناترسیت !؟؟)).

((نەء ناترسم !)).

تووڕەیی لە سیمایدا دەرکەوت، بە هەڵەشەییەوە قیژاندی :

((گوێم لە چییە ؟؟، تۆ.. لەمردن ناترسیت !!؟؟ )).

وەڵامم نەدایەوە، بێدەنگییەکی قورس باڵی بەسەر ژوورەکەدا کێشا، هەستمکرد ئاژەڵێکی دڕندەیە وهێرش دەکاتە سەر لاشەم، پاشان سەرۆکی پۆلیسخانە بە ساویلکەییەوە وتی :

((تۆ.. بۆچی باڵات بەرزە ؟؟ باڵابەرزەکان هەمیشە ئاژاوەچین !)).

((بەم شێوەیە لەدایك بووم)).

سەرۆکی پۆلیسخانە بەدەستەسڕێکی سپی دەم و پلی سڕی، پەنجەی نا بە زەنگەکەدا، یەکسەر دەرگاکە کرایەوە و پێنج پیاو خۆیانکرد بە ژووردا، لەچواردەورم وەستان و بە ڕقەوە سەیرم دەکەن، سەرۆکی پۆلیسخانەکە پێی وتم :

((کەواتە تۆ ناترسیت !؟؟ بگری دەی)).

((ناگریم !!)).

پیاوەکان پەلاماریاندام، ناچاریان کردم کە پێڵاوەکان و گۆرەوییەکانم داکەنم، سەرۆکی پۆلیسخانەکە بەدەم هەڕەشەکردنەوە قیژاندی :

((گۆرەوییەکانت دەدڕێنم ئەگەر نەگریت !!!)).

بە پاڕانەوەوە وتم :

((باشە.. دەگریم !!)).

سەرۆکی پۆلیسخانەکە وتی :

((دەی.. زووکە.. گریانێکی پڕ لە ڕیسوایی بگری !!)).
پیاوەکان پێکەوە بە دەنگێکی زبرەوە قیژاندیان :
((بگری.. بگری !)).
ئەوکاتە منداڵانم بیرکەوتەوە کە هەزار مۆم دەدرەوشێتەوە لە دەنگیاندا، ئاوێنەکانم بیرکەوتەوە کە تێمدەڕوانن بە خۆڕازاندنەوە بۆ دەم و چاوی چرچ و لۆچم، ئەو ماڵە گەرمە داخراوانەم لەزستاندا بیرکەوتەوە، دەمی ئافرەتم بیرکەوتەوە، ئاوی دەریاو لەشی پەککەوتەمم بیرکەوتەوە، بەتوندی کەوتمە گریانێکی تاڵ، لەکاتێکدا سەرۆکی پۆلیسخانە و پیاوەکانی بە خۆشی و سەرکەوتنەوە لەیەکتری دەڕوانن.
سەرۆکی پۆلیسخانە قیژاندی :
(( لەگریان بوەستە !!)).
منیش وەستام و بە پشتی دەستم فرمێسکەکانم سڕییەوە، لەکاتێکدا سەرۆکی پۆلیسخانە وتی :
((ئێستا.. لاسایی زەڕینی کەر بکەوە !)).
ڕازیبووم، بە دەنگێکی زبری وشك کەوتمە زەڕین، تاوەکو سەرۆکی پۆلیسخانە قیژاندی :
((بەسە.. دەی ئێستا دان بنێ بەتاوانەکەتدا و درۆ مەکە)).
منیش بۆم گێڕایەوە، کە چۆن منداڵەکەم سەربڕیوە، منداڵەکە نووستبوو و چاوی نووقاندبوو، منیش بە ئارامییەوە ئەو دەستەی ڕۆژێکی سۆزداری گریاناوی لە قژی ئافرەتێکدا چەقۆ دەڵدەگرێت.. منداڵەکە بەئاگاهاتەوە پێی زانی کە چی ڕوودەدات، هاواری یارمەتی نەکرد دەیڕوانییە گڵۆپی بنمیچەکە، بەدڵتەنگی و دەنگێکی پڕلەگلەییەوە وتی :
((بۆچی جێتهێشتم ؟)).
ئەو بە خۆشییەوە پێکەنی، بەڵام چەقۆکە بە تووڕەییەوە لە قوڕگی گیربوو، خوێنی لێهات، مۆسیقایەکی گەرم و گوڵێکی سوور بوو.

سەرۆکی پۆلیسخانەکە بە دڵخۆشییەوە وتی:

((ئەگەر لەسەرەتاوە دانت بە تاوانەکەتدا بنایە، ئەوا تووشی ئازار نەدەبوویت)).

کاتێك ڕۆژ هەڵهات گواستیانمەوە بۆ دادگا، بە کتوپڕی ڕوانیم خوشکم لەسەر کورسییەکەی دادوەر دانیشتبوو، بەدەنگی بەرز پرسیاری لێکردم ووتی:

((چی دەکەیت لێرە ! ؟)).

بە نارەزاییەوە تێیڕوانیم، هیچ قسەیەکی نەکرد، دوای ئەوە پیاوێکی پیر داوایکرد، کە بە پەت هەڵمواسن، پاشان خەڵکانی تریش قسەیان کرد نەمدەناسین، دوای ئەوە خوشکم بە ڕێزەوە قسەیکرد و بە مردن حوکمی دام،

منیش هاوارم بۆ کرد و پێم وت :

((دەی بگەڕێوە بۆ چێشتخانە)).

دوو پۆلیسی قەڵەو فەرمانیان پێدام، کە بێدەنگ بم و پێیان وتم، کە بڕۆم و بەیانی لە سپێدەدا لەناو گۆڕەپانی سەرەکی ئامادەبم بۆ ئەوەی لەسێدارەم بدەن، بە ڕاکردن لە هۆڵی دادگا چوومە دەرەوە، بەردەوام بووم لە ڕاکردن بە شەقامەکاندا تاکو ماندووبووم و هەناسەبڕکێم پێکەوتبوو کەوتمە سەر زەوی، ئەوەندەی نەبرد گوێم لە دەنگی گریان بوو، بە هەر چوار لادا چاوم گێڕا، منداڵێکی تەمەن دووساڵم بینی هەستامە سەرپێ، بە حەزەوە لێی نزیك بوومەوە، ئەویش لە گریان وەستایەوە، تێیڕوانیم بۆ ماڵئاوایی و هەردوو دەستە بچکۆلەکانی بۆ درێژکردم و دەیوت :

((باوکە.. باوکە !!)).

بە هەناسەبڕکێ و بەپەلە چوومە لایەوە، هەڵمگرت و گەڕامەوە بۆ ماڵەوە.. لەماڵەوە سەیرم کرد خوشکم سەرقاڵی شتنی جلەکانە، کە منداڵەکەم بینی لە خۆشیدا هەناسەیەکم هەڵکێشا، ئەویش باوەشی پێداکردم و بە سۆزێکی زۆرەوە پێدەکەنی، منیش بە شادمانییەوە هەناسەیەکی قووڵم هەڵکێشا، لەسەر کورسییەکی تەختە دانیشتم، دەمڕوانییە خۆرەکە کە خەریك بوو ئاوادەبوو، بۆ چاوەڕێکردنی سپێدە

# هەورە برووسکە

هەور بەیانیان ناچێت بۆ قوتابخانە، منیش فەرمانمدا بەخۆر بەیانیان هەڵنەیەت، بەقسەی نەکردم، بڕیارمدا کە باڵام بەرز بووەوە تۆڵەی لێ بکەمەوە.

سەیری مامۆستا ژمێریاریم کرد، کە سیمای سێگۆشەیی بوو، ئاگای لێم بوو بەتووڕەییەوە قیژاندی :

((کوڕم هەستە !)).

هەستامە سەرپێ لەکاتێکدا مامۆستا بەتووندی و ناڕەزاییەوە بەردەوام بوو لە قسەکانی و وتی :

((بەس لووتت بەسەردەستی کراسەکەت بسڕە!)).

وشك بووم، مامۆستا وتییەوە :

((بەزوویی وەڵامم بدەرەوە.. دە ملیۆن خەڵکمان هەیە، حەوت ملیۆنمان لەسێدارەدا، ئایا چەند کەس لەژیاندا ماون ! ؟؟)).

بەزوویی وەڵامم دایەوە :

((نازانم !)).

مامۆستا بە تووڕەییەوە وتی :

((ئۆف.. تۆ وەك قوتابییەکی نەخوێندەوار دەمێنیتەوە !)).

منیش بەسستییەکەوە پێموت :

((من ڕقم له ژمێریارییه  !!)).

سیمای مامۆستا سوور هه‌ڵگه‌ڕا به‌قیژه‌وه وتی :

((ئا.. كه‌واته تۆ ڕقت له وانه‌ی ژمێریارییه  !!؟؟)).

بۆ ماوه‌یه‌ك مامۆستا سیمای گرژ بوو، پاشان له‌قسه‌كردن به‌رده‌وام بوو و به گاڵته‌جاڕییه‌وه پرسی :

((ڕقت له چییه ؟ ده‌ی پێم بڵێ !)).

((ڕقم له زستانه !!)).

((هه‌روه‌ها ڕقت له‌چیتر ؟)).

((ڕقم له زستان و هاوین و پاییز و به‌هاره)).

((هه‌روه‌ها ڕقت له‌چیتره ؟)).

((ڕقم له‌شه‌و و ڕۆژه)).

((چیتر ؟؟)).

((ڕقم له شه‌ممه و یه‌ك شه‌ممه و دووشه‌ممه و سێ شه‌ممه و چوارشه‌ممه و پێنج شه‌ممه و هه‌ینییه)).

((دەی قسەبکە لە چیتر ؟؟)).
((ڕقم لە خۆر و لە مانگ و لە ئەستێرەیە)).
((چیتر ؟؟)).
((ڕقم لە گۆرانی و پشیلەو چۆلەکەشە)).
((چیتر ؟؟)).
((ڕقم لەپیاوە، ڕقم لە ئافرەتە، ڕقم لە منداڵانە)).
کاتێك مامۆستا قیژاندی و وتی :
((بێدەنگ بە.. تۆ بەردەوام قوتابییەکی نەخوێندەوار دەبیت !!)).
هەرئێستا بۆمبێکی گەردیلەیم داهێنا، بە هەموو هێزی خۆم خستمە مەترسییەوە، تەقییەوە، ئیتر خۆر لەسەر پاشماوەکان هەڵهات.

## { کورتەیەك لەژیان وبەرهەمەکانی زەکەریا تامر }

- زەکەریا تامر : لەدایك بووی شاری دیمەشق ساڵی (1931 ز).
- کورتەچیرۆك وبیرۆکەی زەمکردنی گاڵتەجاڕیی دەنووسێت لەساڵی (1957) ەوە.
- چیرۆکی ئاراستەکراوی منداڵان دەنووسێت لەساڵی (1968)ەوە.
- لە وەزارەتی ڕۆشنبیری و وەزارەتی ڕاگەیاندنی سوریا کاریکردووە و سەرنووسەری گۆڤاری ((الموقف الادبی)) و گۆڤاری ((ئوسامە)) و گۆڤاری ((المعرفه)) بووە.
- چیرۆکەکانی بۆ زمانەکانی (ئینگلیزی و فەرەنسی و ئیسپانی و ئیتالی و ڕوسی و ئەڵمانی وەرگێڕراون.

چاپکراوەکانی : چیرۆکەکانی :

- حیلەی ئەسپی سپی / لە (دار الریاچ ریس) بۆ کتێب و بڵاوکردنەوە /چاپی یەکەم / 1960 ، چاپی دووەم / 1978، چاپی سێهەم / 1994، چاپی چوارەم / 2001 بەیروت.
- بەهار لەخۆڵەمێشدا / لە (دار الریاچ ریس) بۆ کتێب و بڵاوکردنەوە / چاپی یەکەم / 1963 چاپی دووەم / 1978، چاپی سێهەم / 1994، چاپی چوارەم / 2001 بەیروت.
- بروسکە / لە (دار الریاچ ریس) بۆ کتێب و بڵاوکردنەوە، چاپی یەکەم / 1970، چاپی دووەم / 1978، چاپی سێهەم / 1994، چاپی چوارەم / 2001 بەیروت.
- دیمەشقی سووتاو / لە (دار الریاچ ریس) بۆ کتێب و بڵاوکردنەوە / چاپی یەکەم / 1973 چاپی دووەم / 1978، چاپی سێهەم / 1994، چاپی چوارەم / 2001 بەیروت.

- پڵنگ لە ڕۆژی دەهەم / لە (دارالریاچ ریس) بۆ کتێب و بڵاوکردنەوە / چاپی یەکەم / 1978 / چاپی دووەم / 1981، چاپی سێهەم / 1994، چاپی چوارەم / 200 بەیروت.

- هاواری نوح / لە (دار الریاچ ریس) بۆ کتێب وبڵاوکردنەوە / چاپی یەکەم / 1994، چاپی دووەم / 2001 بەیروت.
- پێدەکەنین / لە (دار الریاچ ریس) بۆ کتێب و بڵاوکردنەوە / چاپی یەکەم / 1998 بەیروت.
- بەرسیلە / لە (دار الریاچ ریس) بۆ کتێب و بڵاوکردنەوە / چاپی یەکەم 200 بەیروت.

**له بڵاوكراوه‌كانی وه‌رگێڕ:**

1- كۆمه‌ڵه‌ چیرۆكێكی وه‌رگێڕاو له‌ عه‌ره‌بییه‌وه‌ له‌ ئه‌ده‌بیی ڕۆمانی (شۆڕشی گوێبه‌نده‌ره‌كه‌) له‌ ساڵی /1959

2- كۆمه‌ڵه‌ چیرۆكی (زه‌رده‌خه‌نه‌ی ژیان) له‌ ساڵی/ 1961

3- كۆمه‌ڵه‌ چیرۆكی (وێنه‌ی باوه‌شی دیواره‌كان) له‌ ساڵی/ 1980

4- كۆمه‌ڵه‌ چیرۆكی (كاروانێكی نوێ) له‌ ساڵی/ 1985

5- كۆمه‌ڵه‌ چیرۆكی (ئاوێزان) له‌ ساڵی/ 2001

6- چیرۆكێكی منداڵان له‌ عه‌ره‌بییه‌وه‌ وه‌رگێڕاوه‌ به‌ ناوی (بیركردنه‌وه‌ سه‌یره‌كان) له‌ ساڵی/ 2001

7- كتێبی گیرفان (فه‌رهه‌نگی زاراوه‌ی زانستیی كارگێڕی) له‌ ساڵی/ 2004

8- وه‌رگێڕانی ژماره‌یه‌ك شیعری كوردی بۆ زمانی عه‌ره‌بی له‌ دیوانێكدا (غسق الشفایف الوردیه) له‌
ساڵی/ 2005

9- وه‌ركێڕانی ژماره‌یه‌ك شیعری كوردی بۆ زمانی عه‌ره‌بی له‌ دیوانێكدا (شذرات من الشعر الكردی المعاصر) ساڵی/ 2010

10- كۆمه‌ڵه‌ چیرۆكێكی منداڵان وه‌رگێڕاوه‌ له‌ عه‌ره‌بییه‌وه‌ به‌ ناوی (حكایه‌ته‌كانی داپیره‌ بۆ ووردیله‌كانی) ساڵی/ 2011